عەزیز نەسین

# ژنانی ووشیار ترسناکترن



وەرگێڕانی : کامیل محەمەد

کۆمەڵە چیرۆک

# ژنانی هوشیار ترسناکترن


نوسینی : عەزیز نەسین

وەرگێڕانی لەفارسییەوە: کامیل محمد

پێداچونەوەی :محەمەد جەمال



چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠٠٧




پێناسی کتێب

ناوی کتێب : ژنانی هوشیار ترسناکترن

بابەت : کۆمەڵە چیرۆك

نوسینی : عەزیز نەسین

وەرگێڕانی : کامیل محمد

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ۲۰۰۷

چاپخانە : چاپەمەنی چوارچرا

تیراژ : ۱۰۰۰ دانە

ژمارەی سپاردن ( ۲۰۵ ) ی ساڵی ( ۲۰۰۷ ) وەزارەتی پێدراوە

## پێڕست

## بەڵێ قوربان...[1]

گوێڕایەڵین قوربان...

بەشی بڵاوکردنەوە نۆ کارمەندی هەبوو، دوراو دوور لەناو ژوورەکەدا دانیشتبووین و سەرگەرمی کاری خۆمان بووین، من و کەریم تازە دامەزرابووین، باقی کارمەندەکانی تر قەدیمی بوون.

هێشتا بەڕێوەبەری گشتیم نەئەناسی و کاتێ هاتە ژوورەکەمان لە جێگەی خۆم هەڵنەسام، یەکێ لە هاوکارەکانم کە لە دوامەوە دانیشتبوو مشتێکی دا لە کەلەکەم!!

- هەستە بەڕێوەبەرە.

هەر کە ناوی بەڕێوەبەرم بەرگوێ کەوت، وەکو ئیسپرینگ لە جێگەی خۆم بەرزبوومەوە.

---

[1] لە رۆژنامەی هەڵوێست بڵاوکراوەتەوە

کابرا بیست سی ملیۆن پارەی هەیە، چل پەنجا کەس لەناو فەرمانگەکەیدا کار ئەکەن ئەکرێ لەبەر پێیدا بەرز نەبیتەوە.

- دانیشن!

هەموو دانیشتین... تەنها ئاغا شەوقی کە لێپرسراوی ئێمە بوو بە پێوە وەستا بوو.

بەڕێوەبەر گوتی:

- بە پێوە وەستان یانی چی؟ من لەم ماستاوساردکرنەوەیە خۆشم نایەت.

شەوقی هێشتا بە پێوە وەستا بوو گوتی:

- فەرمانتە گەورەم دائەنیشم.

لەوە گەڕێ کە دانەنیشت، دەستی گرت بە کەلەکەیەوەو سەری کەچ گرت، بەڕێوەبەری گشتیی کە زۆری لەم پیاهەڵدانە بەر گوێ کەوتبوو نەفرەتی لەو جۆرە کەسانە دەکرد، تەماشایەکی شەوقی کردو بە کەمێ ناڕەحەتییەوە دووبارەی کردەوە:

- ووتم دانیشن.

- گوێڕایەڵین قوربان.

بەڵام دیسان دانەنیشت، سووکی لەمە زیاتر نییە، رابووادرن کە نییە، کابرا رێکەو ڕاستەو بێ توێکڵ ئەڵێ (من ڕقم لەم جۆرە کردارانەیە!!) بەڵام هەمدیسان ملی لار کردەوە، ئەگەر لەپەنا مندا نەبوو ملیم ئەگرت و ڕام ئەکێشاو ئەمگوت (سووک لە هەمووی کەمتر).

بەڕێوەبەری گشتیی تووڕە بوو هاواری کرد:

- تۆ بۆچی دانانیشی؟ ووتم لەم جۆرە کارانە خۆشم نایەت، دانیشەو سەرگەرمی کارت بە.

- گوێڕایەڵین قوربان.

قسەی ئەکرد، بەڵام دانەئەنیشت، بەڕێوەبەری گشتیی نەیئەزانی بڕواتە دەرەوە لە ژوورەکە یان شتێك کە بۆی هاتبوو پرسیار بکات.

ئەمجارە بە هێمنی گوتی:

- بۆچی دانانیشی کاکە؟ فەرموو دانیشەو ئیسراحەت بە!

شەوقی هەمدیسان نەوازشی کردو گوتی:

- ڕێزتان هەیە گەورەم... ئیسراحەتم...!

بەڕێوەبەر پێکەنین گرتی، بەڵام نەك لە خۆشحاڵیدا بەڵکو لە تووڕەییدا:

- ئاغا شەوقی من لەم جۆرە قسەکردنو خۆ بەکەمزانینو ماستاوچێتییە خۆشم نایەت، تێگەیشتی؟

- بەڵێ گەورەم... فەرمانتە گەورەم.

بە ئەندازەیەك ڕقم هەستا بوو ئەگەر بمتوانیایە مشتێکی وام ئەسرەواندە پشتە ملی سەری بکەوتایەتە زەوی... هاوڕێکانم ئەیانگوت (مرۆڤێکی ماستاوچییە) من باوەڕم نەدەکرد... بەڕێوەبەر بەپاڕانەوەوە گوتی:

- برادەر دانیشە!...

- تکا دەکەم گەورەم... مۆڵەت بدەن بەپێوە راحەتم.

بەڕێوەبەر دیتی سوودی نییە پشتی تێکردو ڕوو بە ئێمە گوتی:

- ئەمجارە هاتم بۆ ئێرە کەس بۆی نییە لەجێی خۆی هەستێ...

بەڕێوەبەر لە دەرگا چووە دەرەوەو شەوقی هێشتا بە پێوە وەستابوو، لەدوای ئەوەوە هەر (بەڵێ قوربان... بەڵێ قوربانی) بوو.

نیوەڕو کاتێ بۆ نانخواردن چووین بە کەریمم گوت:

- کوڕە ئەم شەوقییە چەندە ماستاوچییە؟ تا ئێستا شتی وام نەدیوە نەیشم بیستووە!!

کەریم وەڵامی داوە:

- کاتی ئەم ماستاوچییانە بەسەر چووە، ئەمانە پێیان دەڵێن ماستاوچێتی رۆژهەڵاتی.

پرسیم:

- بۆچی ماستاوچێتی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی هەیە؟

- بەڵێ گیانەکەم... ماستاوچێتی رۆژهەڵاتی ئیتر کۆن بووە، لەم ڕووەوە بەڕێوەبەری گشتیی لەم جۆرە ماستاوچێتییە نارەحەت ئەبێ وە ئیلا هیچ کەس بە لایەوە گران نییە تاریفی بکرێ و رێزی بۆ دابنرێ.

ماستاوچێتی ڕۆژئاوایی بەو جۆرەی دەروونناسان دەڵێن زیاتر بە دڵەوە ئەچەسپێ، هەروەك چۆن ئاغای بەڕێوەبەری گشتیی بەو جۆرە ئەڵێ (من لە ماستاوچێتی خۆشم نایەت) ئەگەر ڕێك بکەوێ ماستاوچییەکی ئەوروپایی بێت ئەوکات ببینە، ئەو کە دەڵێ (حەزم لەماستاوچێتی نییە) مانای وایە ئەو جۆرە ماستاوچێتییە کە من ئەمەوێت بە دەست ناکەوێت، زۆر دڵم بۆی دەسووتێ، ڕاوێژکاران کە لە بەدەرم ملیۆنەها ئەمریکی کار ئەکەن پیشەیان تەنها ماستاوکردنە هەڵبەت بە شێوەی ئەوروپی نەك وەك ئەم شەوقییە بێ مێشکە.

گوتم:

- کەریم گیان تۆ ڕێگەی ئەو کارە شارەزایت؟
- بەڵێ، هیچ ڕێگەکەی ئەزانم، زانستەکەشی ئەزانم، لە فەلسەفەکەشی ئاگادارم ئەتەوێ تاقیی بکەمەوە؟

ماوەیەکی زۆر درێژەی نەکێشا کەریم پڕو پاگەندەکەی جێبەجێی کرد، مووچەی من (٢٥٠) لیرە بوو، کەریم کە سێ مانگ بەر لە من دامەزرابوو هەر بەو جۆرە مووچەی وەردەگرت، یەکەو ڕاست بینیم مووچەی کەریم بووە (٣٠٠) لیرە چەند دانەیەك لە کارمەندە قەدیمییەکان کردیانە هاتو هاوار، بەڵام زۆری پێ نەچوو مووچەی کەریم بووە دوو ئەوەندە!!

ئاغا شەوقی (٤٠٠) لیرەی وەردەگرتو لەسەر بڕیاری بەڕێوەبەری گشتیی کەریم بە لێپرسراوی بەش دانراو شەوقی بە

ناوی جێگر دانرا، بەرەو پێش چوونی کەریم بەوەندە کۆتایی نەهات لە دوای ماوەیەکی کەم مووچەکەی بووە (٧٥٠) لیرە بە ناوی سکرتێری بەڕێوەبەری گشتیی هەڵبژێرا.

هەرچەندە مووچەی کەریم بەرەو ژوور بچوایە ئەوا جیاوازی لەگەڵ ئێمە زیادی ئەکرد، ئەڵبەت ئێمەش رێزێکی زۆرمان لێ ئەگرتو فەرمانەکانیمان جێبەجێی دەکرد، بەڵام ئاکاری ئاغا شەوقی لەم لایەنەشەوە لەگەڵ ئێمە جیاوازیی هەبوو.

لەگەڵ ئەوەی کەریم ماوەیەک کارمەندی ژێر دەستی ئەو بوو هەر کە ئەوی ئەبینی دوگمەی چاکەتەکەی ئەبەستو نەوازشێکی بۆ ئەکردو ئەیگوت:

- گەورەم... فەرمانێکتان هەیە بە من... بەڵێ قوربان، گوێڕایەڵین قوربان.

لەگەڵ ئەوەی کەریم مۆڵەتی ئەدا دابنیشێ، بەڵام شەوقی هەرگیز نەیدەوێرا!!

جارێك بەرگوێم کەوت کەریم ئاغا لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتیی بۆ گەشتکردن بۆ ئەوروپا چوون کاتێ لە سەفەر گەڕانەوە مووچەی کەریم بوو بە (٢٥٠٠) لیرەو دواتر گەیشتە (٥٠٠٠) لیرەو بوویە هەمە کارەی بەڕێوەبەری گشتیی!

هەر کاتێ بەڕێوەبەر لەوێ نەبووایە کارەکانی کەریم ئەنجامی ئەدا، بەڵام هەرکات کەریم نەبووایە هەموو کارەکان ئەوەستان!! وابیر نەکەیتەوە کەریم مرۆڤێکی زیرەكو کارزان بوو بێت یان زۆر

خاوەن ئەزموون بووبێت! نەخێر لە مرۆڤە سادەکانیش کەمتر بوو، ئێستا بۆچی ئەوەندە بوبووە جێی باوەڕی بەڕێوەبەری گشتیی هیچ کەس نهێنییەکەی نەدەزانی، من لە قسەکانی یەکەم رۆژەوە شتێك تێگەیشتبووم، بەڵام بە تەواوی چ کارێکی کردووەو ماستاوچێتی رۆژئاوایی چۆنە ئاگاییەکم نەبوو.

پاشتر کاتێ بە بۆنەی یادی بیستەمین ساڵەی دامەزراندنی فەرمانگەکان جەژنیان گرتبوو، ئەم باسەم بۆ ئاشکرا بوو، جەژنی ئەو شەوە لەناو هۆڵی یەکێ لە چێشتخانە گەورەکان بەرپا کرابوو هەموو کارمەندەکان بانگهێشت کرابوون، من لە سەرەتای جەژنەکەوە ئاگام لەوە بوو کورسی نزیك بەڕێوەبەرو کەریم هەڵبژێرم، سێ کورسی لەوان دوورتر بووە نسیبم هەوڵم ئەدا قسەکانی بەڕێوەبەرو کەریم بە باشی ببیستم بە تەواوی سەرنجەوە گوێمدا بە قسەکانی ئەوان.

بەڕێوەبەری گشتیی پەرداخێ مەشروبی هەڵگرت بە سەلامەتی هاوکارانی بیخوات، کەریم خێرا دەستی گرت و گوتی:

- تکا دەکەم... تۆ ئەزانی زیانی هەیە بۆتان!

بەڕێوەبەر بە پێکەنینێکی دۆستانەوە وەڵامی داوە:

- قەیناکات هەموو شەوێك جەژن نییە!

کەریم بە کەمێ توڕەییەوە دووبارەی کردەوە:

- نە... باش نییە... ئێستا کەیفی خۆتە... بەڵام بەیانی نابێ لەبەر ناڕەحەتی دڵ هاوار بکەیت.

بەڕێوەبەر پەرداخەکەی لەسەر مێزەکە دانا دوای چەند دەقیقەیەك گوتی:

- هەوا زۆر گەرمە پەنجەرەکان بکەنەوە.

هەر کە ئەم وشەیەی لەدەم دەرهات ئاغا شەوقی رایکرد بۆ لای پەنجەرەکەو گوتی:

- بە گوێڕایەڵییەوە قوربان.

بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە پەنجەرەکە کەریم بە توڕەییەوە هاواری کرد:

- پەنجەرەکە نەکەیتەوە.

دواتر گەڕایەوە بۆ لای بەڕێوەبەری گشتیی و گوتی:

- تۆ ئارەقت کردووە، ئەگەر پەنجەرەکە بکەینەوە ناڕەحەت ئەبیت.

بەڕێوەبەر بە جوڵاندنی سەری قسەکانی کەریمی سەلماندو دەستەسڕەکەی دەرهێناو عارەقەکەی سڕی. دواتر دەستی برد پەرداخیٰ ئاوی تێکردو ویستی بیخواتەوە کەریم هەمدیسان بەرگری لیٰ کردو گوتی:

- ئەمشەو چیتە؟ کاری عەجیب و غەریب ئەکەی!

- ئەمەوێت ئاو بخۆمەوە!

کەریم سەری بە ڕاست و چەپدا باداو گوتی:

- مەگەر ئامۆژگارییەکانی پزیشکت لە بیر چۆتەوە!

پاشان گارسۆنەکەی بانگ کردو گوتی:

- ئا بتلێك ئاوی پاڵفته بهێنه.

بەڕێوەبەری گشتیی هەرکارێك بیویستایە بیکات کەریم ئاغا نەیدەهێڵاو بەڕێوەبەریش موو بەموو فەرمانەکانی کەریمی ئەنجام ئەدا.

کاتێ هەموو ئارەقمان کردبوو کەریم گوتی:

- وا باشترە کەمێك پەنجەرەکان بکەینەوە.

هێشتا قسەکەی تەواو نەبووبوو ئاغا شەوقی وەکو ئیسپرینگ لەجێی خۆی هەستاو ڕۆیشت بۆ لای پەنجەرەکە بەڕێوەبەری گشتیی لەداخی ئاکارەکانی ئاغا شەوقی وەکو شێت هاواری کرد:

- مەگەر تۆ خزمەتکاری؟ لەجێی خۆت دانیشە.

- فەرمانتە گەورەم.

پاشان بەڕێوەبەر بۆ ئەوەی توڕەییەکەی دەرکا ویستی جگەرەیەك دابگیرسێنێ، بەڵام کەریم بەرگری کردو گوتی:

- ئەمە سێیەمین جگەرەیە ئەمڕۆ ئەیکێشی تکایە یەك نەفەس زیاتری لێ مەدە.

هەموو بیرو هۆشی من لای ئەوان بوو، جارێك کەریم بە هێواشی بە بەڕێوەبەری گوت:

- بڕیار بوو ئەم جلو بەرگە قاوەییە ئیتر لەبەر نەکەیت تۆ چۆن ئەوەندە بێ سەلیقەی!

ماوەیەکی تریش لە ڕەفتارو ئاکاری ئەم ملیۆنێرە وردبوومەوە مرۆڤێك بەم قەدو قەوارە ڕێك وەکو منداڵێك وابوو! دوای ئەوەی نانی ئێوارەمان خوارد کەریم تەماشایەکی سەعاتەکەی کردو بە بەڕێوەبەری گوت:

- هەڵسین بڕۆین... کاتی خەوی ئێوە گەیشتووە!

بەڕێوەبەر حەزی نەدەکردو گوتی:

- با کەمێکی تر دانیشین.

- نا نابێت سەعات نۆو نیوە تا بگەینە ماڵەوە ئەبێتە دە، تۆ سەعات دە ئەبێت بچیتە ناو جێگەی خەو.

لە کاتی هەڵساندا کەریم پەرداخێك مەشروبی هەڵگرت بیخوات من خێرا دەستیم گرتو گوتم:

-چی ئەکەی بابە؟ لەسەرەتای شەوەوە تا ئێستا ئەمە پێنجەمین پەرداخە... بۆ هیچ لە بیری سەلامەتی خۆتا نیت.

کەریم ڕووی بۆ لای من وەرگێڕاو دەستی کرد بە پێکەنینو دەستی خستە سەرشانمو منی کێشایە کەنارو گوتی:

- ئافەرین... جیاوازی نێوان ماستاوچێتی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی باش فێر بوویت... هەڵبەت دەرسی زیاتر هەیە پێویستە فێر بیت، بەڵام لەم تاقیکردنەوە بچوکەدا پیشانتدا ئامادەییت هەیە، باشە مووچەکەت چەندە؟

- دووسەدو پەنجا لیرە!

- بوو بە پێنج سەد! برۆ کاری شەوقی وەربگرە لە ئێستە بە دواوە جێگری تۆیە!

ئاغا شەوقی چوو دەرگای بۆ بەڕێوەبەرو کەریم کردەوەو بە نەوازشەوە گوتی:

- خوداوەند ئێوە بپارێزێ... زیندوو بمێنی.. بە میوانیی ئەمشەو هەموومانت سەربڵند کرد!

من هاوارم کرد:

- برۆ ئەو لاوە ماستاوچی... تۆ ئابڕووی هەموو ماستاوچییەکانت برد... هەموو شتێك سنووری هەیە... برۆ لەبەر چاوم ون بە.

ئاغا شەوقی لەگەڵ ئەوەی زۆر ناڕەحەت بوو هەمدیسان بچوکی خۆی پیشانداو گوتی:

- بەڵێ قوربان، گوێڕایەڵین قوربان.

## ئێمەش مرۆڤین

خوداوەند لە مردووی هەموو لایەکمان خۆش بێت، کۆچکردووی باوکی منیش بخاتە ژێر ڕەحمەتی خۆی، خانوویەکی خشتو گڵی بۆ بەجێهێشتین... تاوەکو خۆی لە ژیاندا مابوو ئاگاییەکمان لە کرێ نشینیو ماڵ بەکۆڵی نەبوو، دوای مردنیشی تا ماوەیەك ڕەحەت بووین، بەڵام کاتێ برا بچوکەکەم ژنی هێنا ژیانی ئێمە ژێرەو ژوور بوو.

لەم ماڵە میراتییەدا دوو بەشی هی من بوو، دوو بەشی ماڵی براکەمو باقیەکەشی بەشی دوو خوشکەکەمان بوو، لەسەر ئەم ئامارە لە پێنج ژووری ماڵەکە، لە دوو ژووری ماڵەکەدا من دا ئەنیشتم، دوو ژووریش بە دەست براکەمەوە بوو بەشی خوشکەکانیشمان دابوو بە کرێ بە خێزانێکی شەش کەسی، ژنی براکەم لە قەرەچ ئەچوو لە جیاتی سۆزو میهرەبانیو

خۆشڕەفتاری تا دڵت بخوازێ ناحەزو بەد ڕەفتار بوو نازانم چی دەرخواردی براکەم دابوو ئەقڵ و هۆشی لێ سەند بوو.

ئەو براکەمی وەکو بوکەڵەیەک لەناو دەست هەڵ ئەسوڕاندو ئەگەر بیگوتایە (ماست ڕەشە) براکەم ئەیسەلماند!

ژنە خۆشیی لە ژوورەکانی خۆیان نەدەهاتو چاوی بڕیبووە ژوورەکانی ئێمە... لەبەر ئەوەی نێوان منو براکەم تێک نەچێ گوتم:

- ئێوە بێنە جێگەی ئێمەو... ئێمەش دێینە جێگەی ئێوە.

جێگەمان گۆڕییەوە منو ژنەکەمو کوڕە گەورەکەمو کچە پێ بەخێرەکەم لەگەڵ دوو منداڵی بچوک چوینە نێو دوو ژووری بچوک، دوو ژوورە گەورەکەمان دا بەو دوو نەفرە، بەڵام بۆچی ژنە بەوەش دەست بەردار بوو؟ هێشتا مانگێک تێ نەپەڕیبوو، ژنە کەوتە گەڕ کردن، بە درێژایی ساڵێک جێگەمان ئەگۆڕی، ژنەکەم خوا لێی رازی بێت، ژنێکی چاکو گوێڕایەڵە هەرچی پێ بڵێت سەر بەرزناکاتەوە... لەو جۆرە کەسانەیە منداڵێک ئەتوانێ بدا بە سەرياو نانەکەی لەدەست بڕفێنێ.

بە ڕاستی لەبیرم چوو خۆم بناسێنم، ببورن لەم ڕۆژانەدا بە ئەندازەیەک گێژو وڕ بووم تەنانەت ناوی خۆیشم لەبیر چووەتەوە، ناوم کەریم کاردروستە، کارمەندی شارەوانیم مانگی بە (٢٥٠) لیرە لە بەشی پەروەندەی گۆڕستان کار ئەکەم.

ماوەی بیست ساڵە لەپشت هەمان مێز دانیشتووم نە کەس کاری بە کارمەوە هەیە نە من کارم بە کاری کەسەوە هەیە.

لە ئاکاردا مرۆڤێکی بە تەرتیبم، هەم لە کاروباری فەرمانگە هەم لە کاروباری تایبەت بە ماڵو ژیانم، لەو کەسانەم کە ژیانم لە ڕێگەی ڕاستەوە بەسەر ئەبەم لەم ڕووەوە هەموو منداڵەکانم هاوشێوەی خۆمن، ژنەکەم کوڕە پوورو ئامۆزاو خاڵۆزای جۆراو جۆری نییە! لەناو ماڵدا، لەسەماو گۆرانیو ئاوازو بەزمو باڵۆرە خەبەری نییە!

عەسران لەگەڵ مریشکەکاندا کە دەچنە کولانە، لە ماڵەوە کۆ دەبینەوە، بەیانیانیش بە دەنگی کەڵەشێر، هەمووومان لەماڵ دەر ئەچین.

ڕۆژێك لە فەرمانگە گەڕامەوە ماڵەوە، دیمەنێکم بینی ئارامی چەند ساڵەمی تێك دا باشە چیم دیبێ باشە؟

ژنە شڕشێتەکەی براکەم ژنەکەی منی نابووە ژێرو لێی ئەدا! بەڵام چۆن لێدانی؟ بە لەقە، بە بۆکس، بە زللە، بە تاکە پێڵاو.

نەمدەزانی چیبکەم؟ بڕۆمە پێش؟ نەڕۆم...؟

هاوارێکم کرد سوودی نەبوو... لەسەر خۆ گوتم:

- براژنی بەڕێز؟ ژنی برای خۆشەویستم! هێشتا قسەکانم تەواو نەبووبوو براژنەکەم مشتێکی وای سرەواندە سەرسنگم، مەنجەڵێ چێشتم ڕشتو خۆیشم کەوتمە ناوەڕاستی ژوورەکە.

لەو رۆژە بەدواوە براکەم‌و ژنە بێ چاوو ڕووەکەی پێیان لێ کردینە کەوش‌و گوتیان ((یا بەشی ئێمە بکڕە، یان بەشەکەت بفرۆشە)) من لیرەیەك پاشەکەوتم نییە!!

بڕیار بوو ئەو بەشی من بکڕێت. چون لە حاڵی من ئاگادار بوو پەیامی نارد (من بەشی تۆ بە سێ هەزار لیرە ئەکڕم))

وەڵامم داوە ((پیاوی باش بەشی من چوار پێنج هەزار لیرە نرخیەتی)).

براکەم گوتی:

((هەرکەس ئەیکڕێ بیفرۆشە من بە زیاتر کڕیار نیم)) ئەمزانی بەم پارەیە کونەمشکێکم پێ ناکڕدرێ، بەڵام چارەیەکم نەبوو نەمدەتوانی لەو ماڵەدا بمێنمەوە، کەسیش نەیدەوێرا بەشەکەم بکڕێ، رازی بووم گوتم:

- زۆرباشە، ئەڕۆم شوێنێك بە کرێ ئەگرم.

ئەگەر ئەو رۆژە ئەمزانی حاڵی بەکرێ گرتنی خانوو لەم شارەدا ئاوایە هەرگیز غەڵەتی وام نەدەکردو نەمدەوێرا ئاوا قسەیەك بکەم.

مامەڵەم تەواو کرد، سێ هەزار لیرەم وەرگرت‌و بڕیاربوو لە ماوەی (١٥) رۆژدا ماڵەکە چۆڵ بکەم.

لەناو فەرمانگەدا کارم بە جۆرێ بوو نەمدەتوانی زۆر غایب ببم وەزعەکەم بۆ یەکێ لە هاوکارەکانم باس کرد، ئەو منی نارد بۆ لای نوسینگەیەکی کڕین‌و فرۆشتنی خانوو زەویی ناسراو. کاتێ

وەزعەکەم بۆ خاوەن نوسینگە باس کرد سەری راوەشاندو وەڵامی داوە:

- وەڵڵا براکەم لەم زەمانەدا خانوو بە مرۆڤی وەکو تۆ نادەن بەخۆڕا کاتت بەفیڕۆ مەدە!

خوێن پەڕییە نێو چاوم! لە خوا بەزیاد بێ فشاری خوێنم نییە. گوتم:

- بۆچی من چ جۆرە مرۆڤێکم کە خانوو بە من نادەن! چ عەیبێکم هەیە؟

خاوەن نوسینگەکە بە خوێنساردیو دەم بە پێکەنینەوە کاتێ قسەکانی من تەواو بوو گوتی:

- تورە مەبە برادەر. خەڵکانی وەك منو تۆ خۆمان بە مرۆڤ دەزانین، بەڵام ئەوانی تر ئێمە لەنێو چوارچێوەی مرۆڤایەتیدا حساب ناکەن..

من زیاتر تورە بووم:

- هەرکەس ئێمە بە مرۆڤ حساب ناکات خۆی مرۆڤ نییە، مەگەر مرۆڤەکان چییان هەیە ئێمە نیمانە؟

دووبارە بە پێکەنینەوە:

- ها.. ها!! ئێستا پێت دەڵێم، هەفتەی چەندجار دەچی بۆ سینەما.

- کارم بە سینەما چییە؟

- هۆڵی شانۆ چی؟

- ئەوێ شوێنی ئێمە نییە!
- بۆ یاری تۆپ تۆپێن ئەڕۆی؟
- لە تەمەنمدا نەڕۆشتووم!
- ڕۆژی چەند کیلۆ گۆشت ئەکڕیت؟
- ئەم مووچە بۆ ئەو مووچە تۆزێك گۆشت ئەکڕم!
- لەدوای نانخواردن شیرینی ئەخۆن؟
- پارەی ئێمە بەشی ئەمانە ناکات!
- کتێب و گۆڤار ئەکڕن؟
- ئەمانە چییە بابە، لە خوالێخۆشبووی باوکمەوە کتێبێکمان بە میرات بۆ جێماوە جارجارێ ئەیخوێنمەوە!
- ساڵی چەند دەست جل ئەدووری؟
- چی ئەڵێی؟ خودا شاهیدە ئەم پانتۆڵەی لەپێمدایە پێنج ساڵ لەمەوپێش بە. نیوداشتی لە بازاڕی کۆنەفرۆشانم کڕیوە، خودا تەمەن بدا بە ژنەکەم ڕاست ئەڵێن (خودا سەرما بە بێحاڵ ئەدا) ئەگەر ئەو کەیبانووی من نەبووایە کاری من دروست نەدەبوو. کاتێ جلوبەرگ ئەکڕم ساڵی یەکەم لەبەری ئەکەم. ساڵی دووەم ڕەنگی ئەکەم، ساڵی سێیەم بەرو پشتی ئەکەم... ساڵی چوارەمیش پشت و ڕووەکەی ڕەنگ ئەکەم. ساڵی پێنجەم پشوویەکی پێ ئەدەم. ساڵی شەشەم ژنەکەم ئەیکاتە جلوبەرگ بۆ منداڵەکان! ساڵی حەوتەم ئەگەر شتێکی لێ

مابووەوە ئەیفرۆشم! ئەگەر بەکەڵك نەهات بۆ پاككردنەوەی قاپ و قاچاخ سودی لێ وەر دەگرێت.

خاوەن نوسینگەکە هێشتا پێدەکەنی و پرسی:

- ئەی رۆژانی پشوو؟

لەم پرسیارە ئیتر وەکو لە کوورە بێمە دەرەوە وەڵامم داوە:

- برادەر مەگەر دەستوری ئاین لە من دەپرسی؟

دووبارە پێکەنی:

- ویستم بە بەڵگە پێت بسەلمێنم من و تۆ لەگەڵ مرۆڤەکان چەند جیاوازیمان هەیە. ئاخر ئازیزم کەسێ ساڵەهای ساڵ نەچێتە سینەماو نەچێتە هۆڵی شانۆو منداڵەکانی بە تامەزرۆیی گۆشتەوە سەربنێنەوە کەی لە ریزی مرۆڤ ئەژمێردرێت؟

خودا بزانێ لە تەریقیدا خەریك بوو بتەقم رازی بووم زەویی قوتم بدا، چەند مرۆڤێکی گێل بووم. ئەگەر نەچومایەتە لای ئەو پیاوە چاو و گوێم نەکرایەتەوە تا ئێستاش هەروام ئەزانی مرۆڤم بە خەجاڵەتی و نارەحەتییەوە لە دەڵاڵەکەم پرسی:

- ببوورە ئێستە من چی بکەم؟

بە جۆرێکی تایبەت بۆ چاوەکانمی ڕوانی:

- بۆچی لە من ئەپرسی؟ وەك ئەوە وایە (کەچەڵ ئەگەر تیمار کەربێ سەری خۆی تیمار ئەکا) لەم رۆژو زەمانەیەدا هەرکەس بتوانێ فەرشی خۆی لەناو دەربێنێ

زۆر زیرەکە. من تەنها دەلالێکی خاوەندارێتیم، چ کارێك ئەتوانم بکەم؟ وەزیری نیشتەجێ بوون ئەبێت دەردی تۆ دەرمان بکات، من چوزانم چارەسەری تۆ چییە؟

باوەڕ بکە تا ئەوکاتە لەم هەراو بەزمە زانیارییەکم نەبوو، نەمدەزانی مرۆڤێك نەتوانێ ژیانێکی ئاسودە بۆ خێزانەکەی فەراهەم بکات بەمرۆڤ حسێب ناکرێت، من تا ئەو کاتە ئەوەندە نەگەڕابووم تاوەکو لەم بارانەوە زانیاری بەدەست بهێنم وام دەزانی هەرکەس لە دونیا بژیو پێی بلێن مرۆڤو بەیانی تا ئێوارە کاربکات ئیدی مرۆڤێکی تەواوە، چونکە ئاگاداری ژیانی مرۆڤانی دیکە نەبووم. تاکو ئەم دەردە سەرییەم بۆ پێش نەهاتبوو هەمیشە خۆم بە مرۆڤێکی بەختەوەر دەزانی، چونکە هیچ ئاگام لەم دونیایە نەبوو.

با زۆر درێژەی نەدەینێ خۆلاسە چەند نوسینگەیەکی تر رۆیشتم بەلام سوودی نەبوو.

چوومە لای نوسینگەیەكو سلاوم کرد:

- ئەم کاتەتان باش.

وەلامێك نەبوو... پرسیم:

- خانوویەکم ئەوێت بۆ کرێ.

- زۆر باشە خانوویەکی زۆر باشمان هەیە ئەتوانی بڕۆین بیبینیت.

- زۆر سوپاس هەرئێستا ئامادەم.

کابرا سەری بەرز کردەوەو سەیری کردمو گوتی:

- وادەزانی هەر تۆ لێرەیت لەگەڵ تۆم نییە!

وەڵامم داوە:

- وامدەزانی بە من دەڵێی بڕۆین تەماشای بکەین، منیش خانوویەکم دەوێت بۆ کرێ.

- خانووی کرێمان نییە.

بێ خوا حافیزی هەستامو هاتمە دەرەوە. خۆلاسە، وەکو کەوچکێك لەنێو مەنجەڵ رایدەی هەموو جێگایەك دەگەڕێ، منیش تەواوی شار گەڕام. گەڕەکێ نەبوو سەری پیانەکەم، دامەزراوەیەك نەمابوو نەڕۆم (نییە... نییە... نییە).

پێنج رۆژ لە مۆڵەتەکەم مابوو تا ئەوکاتە هیچ کارێکم نەکردبوو لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ، لە نیوەڕۆوە تا ئێوارە ئەگەڕام بە شوێن خانوودا، ئیتر نە بە فەرمانگە رادەگەیشتم، نە بە ماڵو ژیانم. رۆژی یازدەهەم دەلاڵێ گوتی:

- من ماڵێکم لایە کرێکەشی هەرزانە مانگی دووسەد لیرە.

هۆش لەسەرم دەرپەڕیو پرسیم:

- چیت وت دووسەد لیرە؟!

کابرا وابیری دەکردەوە من لە روانگەی هەرزانییەکەیەوە سەرم سووڕماوە!

- بەڵێ ئەڵبەت ساڵێك پێشەکی وەردەگرێ.

دوو هەزار لیرەش بابەتی (شت) ئەبێ بدەیت.

- (شت) ئیتر چییە؟

- بۆ تازەکردنەوەو پاککردنەوەی، پێویستیاتە جیاوازەکان ئیتر حسابی منیش... زۆر زۆرە لەبیری خۆمدا حسابم کرد نزیکەی پێنج هەزار لیرەی دەکرد. لەبەر خۆمەوە گوتم (کابرا یا شێتە یان گاڵتە دەکات). ئاخر ئەم برە پارەیە بە وتن ئاسانە، بەلام لە ڕاستیدا، دانی پارەیەکی وا باوکی مرۆڤ دەردێنێ تا ئەو هەموو پارەیە بژمێرێت!..

گوتم:

- برادەر بۆچی قیافەی من وەکو قاچاخچییەکان؟

گوتی:

- ڕێزت هەیە ئەو قسانە چییە؟

زۆر تووڕە بووم، وەڵامم داوە:

- وابیر دەکەیتەوە ئەمەوێت قومارخانە دابنێم یان دزم. نە براکەم تا گەیشتومەتە ئەم تەمەنە بە سەربەرزی ژیاوم.

دەڵاڵ گێژو حۆل بوو، گوتی:

- کاکە بۆچی تووڕە بوویت؟

- چۆن تووڕە نابم، ئاخر ئەگەر کەسێ مرۆڤێکی دروست بێ ئەم هەموو پارەیە لەکوێ دێنێ؟

خواحافیزیم کردو دەرگاکەم بە توندی پێوەدا، چوومە دەرەوە کابرا هێشتا بە شوێنما بۆڵە بۆڵی ئەکرد.

بەیانیش کە تەنها سێ رۆژ مۆڵەتم مابوو نوسینگەیەکی ترم پەیداکرد، کاروباری زۆر لە برەودا بوو، جگە لە پەیداکردنی خانوو چەند ئیشی تریشی ئەکرد. (پەیداکردنی ماڵی تایبەت، نووسینی سکالانامەی تۆمار، پەیداکردنی مامۆستای تایبەتی مۆسیقا، پەیداکردنی کار، ئامادەکردنی کارەکەرو نۆکەر)

بە هێواشی سەرم بردە ناو دوکانەکەیی و پرسیم:

- برادەر تۆ دەلاڵی؟

هەر کە وشەی دەلاڵ لە دەمم هاتە دەر وەکو جوێنم بە شەرەفی دابێ لەجێی خۆی هەستا و چاوەکانی نوقاندو زاری کردەوە:

- کاکە گەیشتویتە ئەم تەمەنە هێشتا نازانی چۆن قسە ئەکەیت؟! دواتر دەرگای نوسینگەکەی کردەوەو شوێنی دانیشتنی پیشاندام!

- من ئەندامی ژووری بازرگانیم دەفتەری مۆرکراوم هەیەو ماڵیات بە دەوڵەت ئەدەم دەلاڵ مانای چی؟! من کۆمسۆنەرم.

- زۆر داوای لێبووردن ئەکەم ئاگام لەخۆم نەبوو.

بە بەردەوامی پێنج دەقیقەی تر قسەی کرد، وانەزانی شتێکی بە من وتبێ، شتانێکی ئەوت لەبارەی گرفتاری خۆی و ناجۆری حاڵی بوو، خۆتان ئەتوانن بۆی دابنێن... ئاخر کابرا زۆر گرفتار

بوو، بەبڕوای من مرۆڤێکی زۆر باش دەرهات بەتایبەتی کاتێ گوتی (خانوویەکی پڕ بەپێستی تۆمان هەیە) بە ئەندازەیەک خۆشحاڵبووم کە حەزم دەکرد هەستمو ماچی بکەم!! گوتم:

- خێرا بڕۆین پیشانم بدە...

ئاگارییەکی بە دیوارەکەوە هەڵواسیی بوو پیشانی دام بە خەتێکی گەورە نوسرابوو (بۆ پیشاندانی خانوو پێنج لیرە لەپێشەوە وەردەگرین، ئەگەر خانووەکەشت بەدڵ نەبوو پارەکەت بۆ ناگەڕێتەوە).

پێنج لیرەم پێشکەش کردو کەوتینە ڕێ، لەڕێگادا دەڵاڵ باشی تاریفی ئەکرد:

(خانوویەکە وەك پاکەتی شقارتە بەهەر جۆرێ تۆ بتەوێ! وەك جلی مەیمونە کە بەرگدروو تەسك بۆی دوری بێ هەمووی یەك قات ڤێلایە. ڕێڕەوەکەی وەك پاقلەیە، ژوورەکانی وەك لۆبیایە).درێژەی نەدەمێ، گەیشتینە بەردەم بینایەکی زۆر بەرز مرۆڤ حەزی بە تەماشاکردنی دەرەوەی ئەکرد. چووینە قاتی دووەم (زڕ... زڕ... زڕ) زەنگمان لێدا دەرگا نەکرایەوە.

دەڵاڵەکە گوتی:

- باشە چی بکەین کەسێك لێرە نییە، با بگەڕێینەوە.

من یەکسەر وەکو پەیکەرێکی بێ گیانم لێ هاتبوو پرسیم:

- برادەر خانووی تر نییە؟

- چۆن ئەكرێ نەبێ، هەیە بەڵام من بۆ هەر خانوویەك حەقی كۆمسیۆن وەردەگرم، ژیانی ئێمە لەم رێگەیەوە ئەگوزەرێ.

پێنج لیرەی ترم دا لە بەدبەختی من هەموو دەرگاكان داخرابوون! كاتێ بیستو پێنج لیرەی كۆمیسۆنانەم داو هیچ كارێكم ئەنجام نەدابوو، زۆری نەمابوو لەبەر ماندویی و ناڕەحەتی دەست بەگریان بكەم، دەستم كرد بە پاڕانەوە:

- كاكە توخوا یارمەتیم بدە، لەبەر رەزای خوا با بەدەستی خاڵی نەگەڕێمەوە، لەبەر گەڕان بەدوای خانوودا قاچەكانم ئەلەرزێ.

كاكی دەلاڵ ببووره (كۆمسیۆنەر) زۆر ناڕەحەت بوو گوتی:

- ئەمڕۆ تەواو بوو بەیانی وەرە ئەبێ بەهەر جۆرێك بێ تا نیوەڕۆ خانوویەكت بۆ بگرم.

كاتێ گەیشتمە ماڵەوە وەكو مردووەكان هاتمەوە، ژنە بێچارەكەم لە خۆم ماندووترو ناڕەحەتتر بوو بەویشم گوت:

- دەلاڵ پەیمانی داوە بەیانی خانوویەكی باشمان بۆ پەیدا بكات بەیانی زوو هەموو كەلوپەلەكان كۆبكەرەوە بۆ ئەوەی كاتێ مامەڵە تەواو بوو خێرا شتومەكەكان بگوێزمەوە.

بەیانی زوو ژنەكەم بە زەحمەت لەخەو بێداری كردمەوە. لەماڵ هاتمە دەرو چوومە بەردەم هەموو دووكانەكانی گەڕەكو قەرزی

هەمویانم دایەوە دوایی حسابم کرد (٢٦٠٠) لیرەم بۆ مابوویەوە یەکڕاست چوومە بەردەم دەلالەکەی دوێنێ‌و گوتم:

- ئینشائەڵلا ئەمڕۆ پەیمانەکەتان جێبەجێی دەکەن

- وەڵلا ڕاستت ئەوێ خانوویەکی بابەتی تۆم لا نییە، بەڵام ئەگەر بڕۆیتە لای نوسینگەی ڕاستگۆ ئەوا بەدڵنیاییەوە کارێکت بۆ ئەکات.

چووم بۆ لای ئەوو هەموو شتەکانم بۆ باسکردو گوتی:

- پێنج پەنجەی دەست بران، بەڵام هەموویان چونیەك نین، ئێستا ئەگەر کەسێك ئەزیەتی تۆی داوە پەیوەندی بە کەسانی ترەوە نییە، ئێمە دایك‌و باوك دارین.

بە قیافەیدا مرۆڤێکی باش دیار بوو، بەبێ ئەوەی وشەیەك بڵێت پێنج لیرەم بۆ ڕاگرت.

- فەرموو ئەمە هەقی تۆیە.

بەڕێگا ڕۆیشتین ماڵەکە ببینین. لەناو ڕێ دەستی بەتاریف کردنی ماڵەکە کرد:

- ئێستا ئەیبینی چەند چاکە! سێ ژوور، چیشتخانەکەشی ڕۆشن‌و گەورە، باڵکۆنێکی خۆش دیمەن. هەموو شتەکانی باش‌و چاکن! لە شەقامەکە لاماندایە کۆڵانێك، لەسەرەو خوارەیەك تێپەڕین لە گۆڕەپانێکی خاکی ڕەد بووین، لەسەرەو خوارەیەك

چووینە خوار، لاماندا بەلای دەستی ڕاست، دواتر لاماندا بەلای دەستی چەپ. سەرەنجام لە کۆڵانێکی بن بەستدا سەرمان دەرهێنا.

کاکی ڕاستگۆ گوتی:

- ئێرەیە.

ئەو شوێنەی نیشانی دام ماڵ نەبوو، تازە ئەیانویست ماڵ دروست بکەن، پایەکانی نزیکەی دوو بست لە زەوی بەرزبووبوونەوە وەستاو کرێکار سەرگەرمی کارکردن بوون.

کاکی ڕاستگۆ پرسی:

- چۆنە بە دڵتە؟

دەڵاڵی دایك‌و باوکدار لە ڕووی پایەکانەوە نەخشەی بیناکەی بۆ ڕوون دەکردمەوە، ئێرە ژووری نوستنە، ئەوەش هۆڵە. ئەولاش گەرماوە. ئەولاش...! هەر وەك کابرا لەخەودا قسە بکات ((ئاودەستەکەی گەورەیە، گەرماوەکەشی ڕۆشن! هۆڵەکەشی گەورەیە، ئەگەر ئەتەوێ قاتی سەرەوە بگرە! دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان قاتی دووەمی نیشان ئەدام، منیش بە شوێن پەنجەیدا سەیرم ئەکرد. ((ئەگەر لەهاتنە خوارەوەو چوونەسەر ماندوو نەبی قاتی سێیەم باشترە)).

پرسیم:

- کاکە خەو ئەبینی یا بەنگ ئەکێشی! ئێرە تا ئێستەش ماڵ نییە.

- باشە دووسێ مانگی تر ئامادە نەبێ، لەم ڕۆژانەدا ئاوا ماڵ ئەدەن بەکرێ!

بەیانی ڕۆیشتم بۆ لای دەلاڵێکی ترو گوتم:

- ئەم پێنج لیرە بگرە لەهەر شوێنێك ماڵێکی ئامادە هەیە بۆ کرێ نیشانم بدە.

- زۆرباشە فەرموو با بڕۆین، ماڵێکی ئامادەمان لایە.

ئەگەر خەڵاتێکی گەورەم ببردایەتەوە بەو ئەندازەی خۆشحاڵ نەدەبووم، چونکە تەنها دوو ڕۆژ مۆڵەتم مابوو، دووبەیانی ئەبوا ماڵەکە چۆڵ بکەم. کابرا منی برد بۆ ماڵێك، بەڵام چۆن ماڵێك، ئەو خانووەی لە باپیرمانەوە بۆمان مابوویەوە لەچاو ئەمدا کۆشك بوو، کاتێ بەناویدا هاتوچۆمان دەکرد دیوارەکانی وەکو پردی سەفەری هاتوچۆیان ئەکرد. لە ناو درزی دیوارەکانیدا سیسرك مەیدانی جەنگیان بەرپا کردبوو.

چارەیەکم نەبوو گوتم:

- زۆرباشە کرێکەی چەندە؟

چووم بۆ لای خاوەن ماڵەکە، ئاغا یەکێ بوو لە ژنە شێتەکان و پرسی:

- ژن و منداڵت هەیە یان ڕەبەندی؟

گوتم:

- خانمی بەڕێزو خۆشەویست، ئەمساڵ کە دێت ڕێك بیستو شەش ساڵە ژنم هێناوە.

خانم هەموو گیانی کردبووە گوێچکە لە بەرامبەرم. پرسی؟

- منداڵیشت هەیە؟

سەرم گەرم بوو وەڵامم داوە:

- پیاوێکی وەکو من ئەگونجێ لە دوای بیستو شەش ساڵ منداڵی نەبێت؟!

ئەمجارە خانم تووڕە بوو:

- من خانوو نادەم بە کەسێ منداڵی هەبێ!

(ئێستە وەرە ئەم کەرە لەم قوڕە دەربهێنە) [٢] گوتم:

- خانم منداڵەکانی من لەناو شەکردان نین. یەکێکیان وەختی شوویەتی. یەکیش ئەچێتە سەربازی.

- ناتوانم بیدەم.

بە جۆرێ قسەی کۆتایی کرد، ئیتر قسەو پاڕانەوە سوودی نەبوو، بە دەڵاڵم گوت:

- برادەر شوێنێکی تر نییە؟

- بۆچی شوێنێکی تر هەیە، بەدڵنیاییەوە ئەوێت بۆ ئەگرم. بەیانی وەرە بڕۆین بیبینین، پەیمان ئەدەم ئەوێ شوێنێکی باشە.

---

[٢] دەربڕینی وەرگێڕ

بەیانی رۆیشتم بۆ بینینی ئەو یەکەی تر. خانووەکە زۆرباش بوو، لە ناوەڕاستی شارداو کرێکەشی لەبار بوو، بەڵام کاتێ گەیشتمە بەردەم ماڵەکە، ئاشکرا بوو شەوی پێشتر لەلایەن پۆلیسەوە داخرابوو، تێگەیشتم کابرا ئەیویست یەکێ لە نهۆمەکانی خانووە بەدناوەکە بدا بە من تا لەسایەی مندا لەناو نهۆمەکانی تر سەرگەرمی مشتەری بەڕێکردن بێتو سەر لە پۆلیس بشێوێنێ!

لەتوڕەییدا تفێکم کردە رووی دەڵاڵەکە:

- تف لەچارەت، بێ غیرەت، بەم ئاخری تەمەنەوە ئەتەوێ ناومان لەکەدار بکەیت؟

بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بم کەوتمە رێ، بەرگوێم کەوتبوو جار جار لەنێو رۆژنامەکان ناونیشانی خانووی کرێ دەنوسن. رۆژنامەیەکم کڕیو دەستم کرد بە پەڕە هەڵدانەوە. لەنێو لاپەڕەی یەکەمدا ئاگادارییەکم بەرچاو کەوت خەریك بوو چوار پەلم وشك بێ نوسرابوو:

(چون ئاغای کەریم دروستکار کوڕی خوالێخۆش بوو عەبدوڕەزاق کارمەندی شارەوانی بەشی پاسەوانی گۆڕستان، ماوە پانزە رۆژە بەبێ ئاگاداری لەکاری غائیب بووە بەپێی ماددەی حەوت لە یاسای وڵات لەم بەروارەوە لە فەرمانگە وەدرەنرا!). وەکو کەسێ خۆڵی مردووی کرابێ بەسەردا گەڕامە ماڵەوە.

شتومەکەکانمان فڕێدرابووەیە نێو کۆڵانو ژنەکەم وەکو ڕێبووارێکی غەریب چۆن لە بەردەم گەراج لەسەر شتومەکەکانیان دائەنیشن لەسەر شتەکان دانیشت بوو دەستەکانی خستبووە کەلەکەیی و دۆشداما بوو. خوا باوکی هاوسێکانمان عەفوو کات. شتەکانی ئێمەیان بەسەر دراوسێکاندا دابەش کردبوو، خۆشمان بەسەر ماڵە خزمەکاندا دابەش بووبووین.

هەڵبەت هەرکەس لەجێگەی ئێمە بووایە نەیدەتوانی ئەم حاڵە تامڵ بکات، بەڵام من زۆر ناڕەحەت نەبووم لەبەر سێ هۆ، یەکەم ئەوەبوو دوای پەنجا ساڵ لە ژیان تێگەیەشتم (مرۆڤ یانی چی! بە خۆڕایی ئێمە ناوی خۆمان ناوە مرۆڤ).

دووەم لەکاتی بۆنەو جەژنەکاندا لەسەردانو چوونو گەڕانەوە سەرم سووك بوو، ناچار نەبووم دونیایەك ماستاوچێتیم بەرگوێ بکەوێ.

سێیەم لە ئێستە بەدواوە پاشماوەی تەمەنم لە فەرمانگە بەدیار کەچە مووچەیەکەوە بەفیڕۆ نادەم، بە پاشماوەی پارەی خانووەکە نوسینگەیەکم دامەزراند، چونکە ڕێو شوێنەکەی بەتەواوی فێر بووبووم، بەدەست هەموو ڕێگەکانەوە ماندوو بووبووم. ڕۆژی سی چل کەس دەهاتنە لامو هەر ڕۆژ بەقەدەر مووچەی مانگێکم دەست ئەکەوتو ڕۆژ بەڕۆژ کارم برەوی پەیدا ئەکرد. بەم حاڵەوە کە هەمانە ناچارین (نوسینگەی خانوو زەویی بکەینەوە)

## بۆچی لە وڵاتی خۆتان کەر نییە؟!.

وەکو کەسێ دانی بیەشێت، دەستێکی بەدەمو چاوییەوە گرتبوو، دەستەکەی کەشی بەسەرییەوە گرتبوو، نارەحەت و پەرێشان هاتە نێو ژوورەکەوە، بە تورەییەوە دەستی بە قرەقڕکرد:

- تف!.. ئابڕومان چوو!... بێچارە بووین!

هەیکەلی وا پیشان ئەدا مرۆڤێکی ئابڕودارە، زۆر سەرم سوڕماو گوتم:

- فەرموو دانیشە.

هەروەکو قسەکانی منی نەبیستبێ دووبارەی کردەوە:

- ئابڕومان چوو... شەرەفمان نەما!
- چی بووە؟
- ئیتر ئەتەوێت چی بێ؟ بە کەڵکی وتن نایەت!

لەدڵی خۆمدا وام گومان برد لەوانەیە شتێك روویدا بێ، بە دڵنیاییەوە گرفتێکی خێزانییە، بۆ ئەوەی تووڕەییەکەی کەم بێتەوە لەسەر خۆ گوتم:

- لەم جۆرە روداوانە لە ژیاندا زۆر ڕوو ئەدەن، باشترە کەمێ خوێنسارد بی، لە قسەکانی من زیاتر تووڕە بوو بە نیگایەکی خەمبارییەوە وەڵامی داوە:

- ژیان بەبێ ئابڕوو پوڵێکی قەڵب ناهێنێ.

- چی بووە؟

- چی بووبێ باشە؟ کەرێکی پیرو پەککەوتەیان بە (٢٥٠٠) لیرە بەکابرا فرۆشت.

لە وەڵامێك کە دایەوە سەرسام بووم، وام هاتە بەرچاو کابرا شێت بووە، شێتێکی ترسناك... ترسم لێ نیشت بە بیانووی ئەوەی ژنەکەم بانگ ئەکەم گوتم:

- قاوە ناخۆیتەوە؟

شانەکانی هەڵتەکاندو وەڵامی داوە:

- ئێستە کاتی قاوەخواردنەوە نییە بیرێك لەم کارە بکەرەوە... چۆن ئەبێت کەرێکی تۆپیو بە (٢٥٠٠) لیرە بە کابرایەکی غەریبە بفرۆشن؟

- وەڵڵا تا ئێستا کەرم نەکڕیوەو نەمفرۆشتوە، بەڵام ناچێتە ئەقڵمەوە نرخی کەرێك (٢٥٠٠) لیرە بێت.

پرسیم:

- ئایا عەسابی تۆ تێك نەچووە.؟

- هەڵبەت کە عەسابم تێك چووە! ئاخر کەس بینویەتی کەرێك بە (٢٥٠٠) لیرە بفرۆشن؟

نەمدەزانی وەڵامی ئەم کابرایە چۆن بدەمەوە..گوتم:

- ئەگەر کەرێکی بە نەزاکەت بێ... لەوانەیە!

- ئەم قسانە چییە! کەر کە نەزاکەتی نییە... ئێستا ئەگەر جوان و چاپوك بووایە مرۆڤ دڵی بۆی نەدەسوتا... ئەو کەرە پیرو پەککەوتەو زامدار بوو.

من بە ڕاستی سەرم سوڕمابوو. پرسیم:

- باشە چۆن ئەم کارەیان کرد؟

- منیش هاتووم ئەمەت بۆ باسکەم.. ماوەیەك لەمەوبەر لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ بینینی دەورەیەك بۆ ئەمریکا چووم لەوێ لەگەڵ پرۆفیسۆرێکی ئەمریکی ئاشنابووم، ئەو کابرایە زۆر لەگەڵم دۆستیی ئەنواند.. دوای ئەوەش کە دەورەکەم تەواوکردو گەڕامەوە نامەمان بۆ یەکتر ئەنووسی... مانگێ لەمەوبەر نامەی بۆ نوسیبووم کە ئەیەوێت دووسێ هەفتە بێتە ئێرەو لەبارەی فەرشچنینی ئێمەوە لێکۆڵینەوە بکات و کتێبێك لەسەر ئەو هونەرە میللییەی ئێمە بنوسێت، داوای لێ کردم وەڵامی بدەمەوە ئایا ئامادەم یارمەتی بدەم یان نە، منیش بۆم نووسی بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە هەرکارێك لەدەستم

بێت دەیکەم، هەریارمەتییەك ئەو بیەوێت ئەنجامی بدەم... ناونیشانی ماڵو ژمارەی تەلەفۆنم بۆ نووسی تا گەیشتە ئێرە هەواڵم پێ بدات... سێ رۆژ لەمەوبەر لەو میوانخانەی لێی مابووەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، منیش خێرا چووم بۆ لای... لە بینینی من زۆر خۆشحاڵ بوو، دوای ئەوەی چاكو خۆشیو ئەحواڵپرسی یەکتریمان کرد، جانتایەکی گەورەی دەرهێناو بە بزەو شەوقێکی منداڵانەوە جانتاکەی کردەوەو گوتی:

- نازانی چەند شتی عەتیقەم [۲] کڕیوە لەناو هیچ مۆزەخانەیەکدا هاوتایان نییە!

چاوەکانم داچڕی ببینم بزانم ئەیەوێت چ گەوهەرێکی گرانبەهام نیشان بدات... لەناو جانتاکەدا خورجێکی کەرو قاڵییەکی بچوكو جوتێ گۆرەویی خوری رەنگکراوی دەرهێناو لەبەرچاوم گرتیو گوتی:

- ئەم فەرشە زۆر بەنرخە... لانی کەم (۳۰۰۰) دۆلار نرخیەتی!.. من بە (۳) دۆلار لە لادێییەکم کڕیوە!

قاڵییەکی کاڵۆ بووی نیشان دام ڕووبەرەکەی (۳) بست پانو (٥) بست درێژبوو، لەبەرچاوی من (۱) دۆلار نرخی نەبوو... پرسیم:

---

[۲] بۆماوە، ئاسار

- نرخی ئەو قاڵییە لە چیدایە؟

بەلەخۆبایی بوونەوە وەڵامی داوە:

- لەهەر سانتیمەتر چوارگۆشەدا هەشتا گرێی تێدایە، شاکارە.

جەنابی پرۆفیسۆر ئەوەندە بەتامو شەوقەوە تاریفی قاڵییەکەی دەکرد هەروەك لە پۆلدا باسێکی زانستی بۆ قوتابییەکانی بکات!

- بەڵێ ئاغا ئەمە شاکارێکی بێهاوتایە... لە دونیادا قاڵییەك هەیە لەهەر سانتیمەتر چوارگۆشەدا (١٠٠) گرێی تیابێ ئەویش ئاشکرا نییە ئێستە لەکوێی دونیادایە

خورجی کەرەکەی نیشاندامو بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

- ئەمە لانی کەم (٥٠٠٠) دۆلار ئەژێ من بە (١٠) دۆلار کڕیومە.

پرسیم:

- ئەو شتە بەنرخانە چۆن وا بە هەرزان ئەکڕی؟

وەڵامی داوە:

- چل ساڵە لەم کارەدا کار دەکەم ئەوەندەم ئەزموون هەیە ئەزانم لەگەڵ لادێییەکاندا ئەبێ چۆن مامەڵە بکەیت!

دواتر دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەو داستانانەی باسی لە زیرەکی خۆی دەکرد لە سەرسوڕماندا دەمم دەکراوە، تێگەیشتم بەم کەڵەکو ساختەچێتییە بۆتە خاوەنی گەورەترین کاکسیۆنی

قاڵی ئاساری کۆن داوای لە من کرد بۆ ئەوەی بۆ لادێکانی ئەو ناوچەیەی ببەم‌و تا ئەو قاڵییانەی بە دڵیەتی بیانکڕێت... لەگەڵ ئەوەی ئامادەی سەفەر نەبووم کارەکانم مابوویان قبووڵم کردو کەوتینە ڕێ... چەند دانە فەرش‌و بەڕەو خورجی کڕی، بەڵام هیچیان بە تەواوی نەدەکەوتنە بەرچاوی، بەدڵ بەدوای شتێکی بێ هاوتادا دەگەڕا. گەیشتینە لادێیەک شوێنەواری پێش مەسیح لەوێدا دۆزرابوویەوە! دوو دەستە ئاسەوارناسی ئەڵمانی‌و ئەمریکی لەو ناوچەدا سەرگەرمی کاری چاڵ هەڵکەندن بوون. زەوییەکانیان هەڵگێڕو وەرگێڕ ئەکرد. گردو تەپۆلکەکانیان وەک لۆکەی لای هەلاج شی ئەکردەوە... تۆزێ دوورتر کۆمەڵێک چادر ئەکەوتنە بەرچاو.. لەناو چادرەکاندا کەلوپەلی ئاساری کۆنی تیابوو وەکو مەنجەڵ‌و گۆزەو مۆمدان‌و پەیکەری برۆنزو کاسەو گۆزەی گڵین هەڵچنرابوو.

بەرپرسی دەستەکە بۆمانی ڕوونکردەوە کە لە قەرنی دەهەمەوە تا ئەمڕۆ ئاساری چەند شارستانییەتی لەژێر خاک دەرهێناوە... دواتر دیواری کۆشکی کۆن‌و گۆڕی کۆن‌و شتی جوان‌و چاک کە دەری هێنابوو نیشانی داین، وا دەهاتە بەرچاو لە کاری خۆی زۆر ڕازییە، تەنها دادی لەدەست گەشتیارە بیانییەکان بوو دەیگوت: (زۆر ئەزیەتی ئەدەن) لەبەر خۆمەوە گوتم: (میوان خۆشی لەمیوان نەدەهات خانە خوێ لەهەردوولا).. کە لەلای ئەو ڕۆیشتین دیتم هەق بەوە.. هەرچەند کیلۆمەتر لەگەڵ

چەندان گەشتیار ڕووبەڕوو دەبووینەوە. هەموویان کڕیاری شتی ئەنتیکەو بەنرخ بروزو بەدوای لادێییەکاندا ئەگەڕان تا ئاسارەکانیان بە هەرزان لێ بکڕن.

خەڵکی دێهاتیش کڕیارەکانیان باش ئەداسی هەر یەکێکیان چەندان شتومەکی زۆر زەری لە گوردشەداو و بەردەڕیەشکاو لەلای خۆیان کۆکردەبووەوە، لە قەراخ شەقامەکە دوکانی ئەنتیکە فرۆشییان دانابوو. لەگەڵ گەشتیارەکاندا لەسەر نرخ چەقە چەقیان بوو، ویرای سەرزەنیان (دە دۆلارو پێنج دۆلار) بوو.

لەبەر خۆمەوە گوتم: (ئێستا خە هاتم بۆ ئێرە... منیش بۆ یادگاری شتێك بکڕم) بەدەست کچێکی بچوکی پێپەتییەوە گۆزە شکاوێك هەبوو. نەخش و نیگارەکەیم زۆر حەز نێبوو. بەدەست کوڕێکی منداڵیشەوە کە لەلای وەستا بوو بەردێکی رەنگ ئاوی گەورەی لەشێوەی جمجمەی مرۆڤم بینی چووم بۆ لایان گوتم:

- کوڕەگیان ئەوانە ئافرۆشی؟

کچە بچوکەکە بۆ گۆزە شکاوەکە (١٠) لیرەی گوت و کوڕە منداڵەکەش بۆ بەردە رەنگ ئاوییەکە (١٥) دۆلاری ئەویست! من هیچیانم نەئەناسی نرخیشیانم نەئەزانی بو ئەوەی هەرزانتری بکڕم گوتم:

- زۆر گرانە!

کچە بچوکەکەو کوڕە بچوکەکە وەکو مرۆڤی گەورە دەستیان کرد بە تاریف کردن لە باشی شتەکانیان.. کوڕەکە گوتی:

- کێ ئەڵێ گرانە؟ بۆ بەدەست هێنانی ئەمە بیست کرێکار ماوەی دە ڕۆژ کاریان کردووە..!

کچە قسەکانی براکەی بڕی و گوتی:

- ئەوانە لەژێر ٥ مەتر زەوییەوە دۆزراونەتەوە ئەگەڕێنەوە بۆ دەورانی پێش لەدایکبوونی مەسیح، ویستم بیانکڕم، بەڵام پرۆفیسۆر نەیهێشت و گوتی:

- ئەوانە بەنرخ نین.

کوڕو کچە لادێییەکە لە قسەکانی پرۆفیسۆر زۆر تووڕە بوون و چەند دانە جوێنیان حەواڵەی باوو باپیری ئەو کرد... خۆشبەختانە پرۆفیسۆر لە مانای قسەکانیان نەدەگەیشت، ئەگینا ئابڕوومان لەبەردەم بیانییەکاندا ئەچوو.

دوایی تێگەیشتم پرۆفیسۆر ڕاستی کرد... لادێییەکانی ئەو ناوچەیە کارو پیشەی خۆیان واز لێهێناوەو دەستیان داوەتە ئەنتیکە فرۆشی... بەڵام چ ئەنتیکەیەك! هەمووی تەزویرو دەستکردی خۆیانەو بە جێگەی شتی ژێر زەویی و ئاساری کۆن بە گەشتیارانی ئەفرۆشن و کڵاو ئەنێنە سەریان.

هەندێ لە لادێییەکان ئەوەندە شارەزا بوون لەم کارەدا هەتا فێڵ لە ئاسەوارناسەکانیش ئەکەن.

یەکێك لەو لادێییانە لاشەی سەگێکی نازانم بە چ دەرمانێك وشك کردبووەوە بە ناوی مۆمیاکراوی سەردەمی فیرعەون بۆ خاریجییەکی قەباڵندبوو. لەوانەیە وابیر بکەیتەوە ئەم کارە هەروا

ئاسانەو لەدەست هەموو کەس دێت؟ نەخێر، باوەڕ بکە لە دروستکردنی بۆمبی ئەتۆم گرانترە... چونکە هەرچۆن بێت دروست کردنی ئەتۆم ڕێگەو یاسای خۆی دیارە... بەڵام ئەم کارانە لەگەڵ هیچ یاساو ڕێسایەك یەك ناگرێتەوە.

ئۆتۆمبیلەکەمان هێواش هێواش بەرەو پێش ئەچوو هەواش زۆر گەرم بوو، پرۆفیسۆر هێشتاش لەبارەی زیرەکی دێهاتییەکانەوە قسەی دەکردو جارجاریش بەدەنگی بەرز پێدەکەنی... لەسەر ڕێگەکە دوو سێ دارو ئاوێکی جوان سەرنجی ڕاکێشاین‌و دابەزین تا لەلای سەرچاوەی ئاوەکەوە لەژێر سێبەری یەکێ لەدارەکان نانەکەمان بخۆین..

پیاوێکی دێهاتی خەریکی دەم‌و چاو شۆرین بوو لە سەرچاوەی ئاوەکە، لەولاتریشەوە کەرەکەی خەریکی ئاوخواردنەوە بوو! سڵاوێکمان لە پیرەمێرەکە کردو گوتم:

- براکەم ئاوەکە پیس مەکە ئەمەوێت ئاو بخۆمەوە.

پیاوە لادێییەکە بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات یان نارەزاییەك دەرببڕێت هەوساری کەرەکەی گرت‌و ڕایکێشا تا لە سەرچاوەکە دووری بخاتەوە، بەڵام کەرەکە ڕازی نەبوو بڕوات!..

جارێك ئاوڕم دایەوە بینیم پرۆفیسۆر دووچاوی هەیە دووانی تریشی بۆ قەرز کردوەو چاوی بڕیوەتە کەری کابرای دێهاتی! پرسیم:

- تەماشای چی ئەکەی؟ ئەڵێی تا ئێستا کەرت نەدیوە!

بە تێڕوانینێکی تەماح ئامێز چاوی بڕیبووە سەراپای کەرەی بەبێ ئەوەی چاو لەسەر کەرەکە لابات بە هەڵچوونەوە وەڵامی داوە:

- ئەو جلەی خراوەتە سەرپشتی ئەوکەرە عەنتیکەیەکی بێ هاوتایە (١٠٠) هەزار دۆلار دێنێ.

تەماشام کرد روپۆشێکی کۆنەی گوڵاوی خراوەتە سەرپشتی کەرەکە، ئەگەر بە خۆڕایی بیاندایە بە من قبوولم نەکرد! بە سەرسووڕمانەوە پرسیم:

- ئەو جلەکەرە پیسە دەڵێ؟

پێکەنینێکی تایبەتی کردو گوتی:

- بەڵێ، ئەوەت پێ دەڵێم، زیاد لە ئەندازە شتێکی ئەنتیکەو کەم وێنەیەو نایابە.

- باشە گەر وایە بۆچی وەستاوی کارت دەستپێبکە.

گەڕایە دواوەو گوتی:

- بۆچی لەگەڵ ئەم لادێییانە ئەکرێ قسە بکەیت! هەر ئەوەندە لە مەبەستت تێگەیشتن ئەگەر خوێن بەهای باوکیان بدەی هێشتا رازی نابن.

- باشە چ کارێك بکەین.

- تۆ تۆزێك بیخلافێنە تا من جارێك بە تەواوی تەماشای بکەم دوایی کە دڵنیا بووم ئەبێ فێڵێك بدۆزینەوە کابرا لە مامەڵەکەمان تێ نەگات.

به بیانووی ئەوەی هاوکاریی پیاوە لادێییەکە ئەدەم کەرەکەی لە ناوەکە بهێنێتە دەرەوە چوومە پێشەوە، پرۆفیسۆر دەستی خستبووە سەر کەفەڵی کەرەکەو هەوڵی ئەدا (جلەکە) تاقی بکاتەوە. بۆ ئەوەی لادێییەکە شك نەبات سەری قسەم دامەزراندو پرسیم:

- لەم ناوچە چ جۆرە بەرهەمێك دێتە بەرهەم؟

پیاوە دێهاتییەکە بەخەمبارییەوە وەڵامی داوە:

- هیچ!
- چۆن هیچ؟
- پێم وتی هیچ!

کابرا زۆر بەراستیەتی هەمدیسان دەستم پێکردەوەو گوتم:

- نە گەنم؟. نە جۆ؟
- هیچ یانی هیچ!

پرۆفیسۆر هێشتا سەرگەرمی تاقیکردنەوەی جلەکەرەکە بوو، ئەبووایە زیاتر کابرا بە قسە بگرم. پرسیم:

- باشە دێهاتییەکان لەچ ڕێگەیەکەوە بژێوی خۆیان بەدەست دێنن؟

- لە ڕێگەی ئاسار فرۆشییەوە! هەرکەسێ پاچو خاکەنازی بەدەستەوە گرتووە لەبەیانییەوە تا ئێوارە ژێرخاك ئەگەڕێ بە شوێن ئاساردا.

دواتر ئاهێکی کێشاو بەردەوام بوو:

- خوا ئەم بیانیانە زەلیل بکات لەرۆژێکەوە پێیان ناوەتە ئەم وڵاتە هەموویان لەکاسبی حەڵاڵ دورخستۆتەوە!!

گوتم:

- ئەمکارە حەرامیەکەی لە کوێدایە؟ ئاساری ژێرخاك دەردەهێنن بە نرخێکی باش دەیفرۆشن بە خاریجی.

- ئەی بابە... چ ئاسارێك لێرە شەش دێ هەیە، ئێوە بچنە هەموو ماڵەکان یەك پارچە فەرش و لەتێك کومبار نابینن... نە کاسە...نە گۆزە... نە گۆزەی گڵین... هیچ لەناو ماڵیان نەماوە.

- بۆچی؟

- بۆچی ناوێ هەموویان بەم خاریجیانە فرۆشتووە!

- جا خاریجی گۆزە شکاو و پارچە فەرشی دێهاتی بۆچییە؟

- بەمجۆرە نایفرۆشن... ئەوانە دەخەنە ژێر خاك و پەستان دەخەنەسەری و بۆ ئەوەی زەنگ بێ، نازانم چ جۆرە دەرمانێکی لێ دەدەن وەکو ئاساری کۆنی لێ دەکات دواتر بە ناوی ئاسارەوە بە بیانییەکانی دەفرۆشن! رەوشتی خەڵکی ئێمە بە تەواوی خراپ بووە، گەورەو بچوك، ژن و پیاو، کچ و کوڕ شەوو رۆژ سەرگەرمی تەڵەکەبازین و کڵاو دەنێنە سەر ئەم خاریجیانە، چەند رۆژ لەمەوبەر کوڕێکی بچوك موریەکی لە

هەوساری کەرەکەی من دەرهێناو بردی ئاساری لێ دروست بکات لەدەستم سەند. ئەمانە لە نالی کەر پارەی کۆن دروست ئەکەن. لە مورووی ملی کەر گەردنبەندی فیرعەونەکان دروست دەکەن! هەتا کچەکان ئیدی ئامادە نین شوو بکەن‌و خێزان پێکەوە بنێن هەموو بوونەتە ئاسارفرۆش!. ئاخر ئەمکارە کوێی دروستەو کێ ئەتوانێ بڵێ ئەم پارەیە حەڵاڵە؟ سەرەنجام رۆژێك هەر ئاشکرا ئەبێ. ئەوکاتە بیانیانییەکان چیمان پێدەڵێن؟! ئەو رۆژە ئیدی لە تەواوی دونیا ئابڕووی میللەتەکەمان دەچێت! ئەو کاتەش ئاسارفرۆشی نامێنێ‌و لادێییەکان کە بە تەمەڵی راهاتوون‌و وازیان لە کشتوکاڵ هێناوە ئەبنە چی؟. یا دەبنە دز... یا سواڵکەر.. ئەوکاتە وەرە چاری بکە!. ئالەبەر ئەمە من بە ئەندازەی ئیزرائیل رقم لەم خاریجیانەیە. لەم وڵاتە بوونەتە مایەی بەدبەختی هاووڵاتیانی ئێمە!

پرۆفیسۆر کاری تەواو بوو، هات بۆ لامان‌و پرسی ئەو پیاوە لادێییە ئەڵێ چی؟

هەموو قسەکانی ئەوم بۆ پرۆفیسۆر وەرگێڕا، هیچ بەلایەوە گران نەبوو، پێکەنینێکی تایبەتی کردو گوتی:

- باشە. لێ گەڕێ با بڵێ.. ئێمە پێویستە پیلانێکی وا داینێین هەرچۆن بووە (جلە) کەی لێ بسێنین. پرسیم:

- ئەو زەحمەتە دێنی؟

- زۆر زیاتر... سی ساڵە لە ڕشتەی ئاسارناسی کار ئەکەم، تا ئێستا شتێکی وام نەدیوە. لەیەک سانتیمەتر (١٢٠) گرێی تێدایە، لە دونیادا بێ هاوتایە!

- ئێستە ئەبێ چی بکەین؟

- من ڕێگاکەی شارەزام لێی بپرسە لە (ئاسار) چی هەیە؟

پیرەمێردەکە وەکو کەسێ لە هەموو قسەکانی ئێمە تێگەیشتبێ لەدەمی پرۆفیسۆر وورد دەبووەوە گوێی گرتبوو، لێی پرسی:

- تۆ لەم ئاسارانە چیت هەیە؟

پیاوە لادێییەکە پێکەنینێکی بەرزی کردو گوتی:

- نە کاکە. من لەم جۆرە نانانە ناخۆم... مرۆڤ لەبرسا بمرێ باشترە لەوەی ناموسی وڵات بە خاریجی بفرۆشێ! بە تایبەتی ئەم ئاسارفرۆشانە کە هەموو کارێکیان هەر ساختەو فێڵبازییە. قسەکانیم بۆ پرۆفیسۆر وەرگێڕاو گوتی:

- لێی بپرسە چۆن پارە پەیدا دەکات؟

لە لادێییەکەم پرسی:

- باشە تۆ چ کارێک ئەکەیت؟

- من خەریکی کڕین و فرۆشتنی گوێدرێژم.

پرۆفیسۆر بە بیستنی قسەکانی خۆشحاڵبوو گوتی:

- کارەکەمان زۆر ئاسان بوو، بە دڵنیاییەوە ئەم کەرەش دەفرۆشی، بەڵام ئەبێ زۆر وریا بین.

لە لادێییەکەم پرسی:

- رۆژی چەند کەر ئەکڕی و ئەفرۆشی؟

پێکەنی

- هەفتەی یەک دوو دانە زیاتر نییە.

- بۆچی کەرێ چەند قازانج دەکات کەوا خەرجیت داین بکات؟

- هێ...هێ... بەستراوە بە وەرزو مشتەرییەوە جاری وا هەیە سێ چوار مانگ هیچم دەست ناکەوێ جاری واش هەیە رۆژی پێنج کەر دەفرۆشم... هەر رۆزییەک بۆ مرۆڤ دیاری کرابێ پێی دەگات!

ئەمریکییەکە پێداگری کرد وشە بە وشەی بۆ وەر گێڕم...

کاتێ کارم تەواو بوو گوتی:

- ئاشکرابوو مرۆڤێکی سادەو دڵپاکە، بەڵام نابێ ئێمە ئاگایی خۆمان لەدەست بدەین. ئێستە ئەبێ یەکێ لە نەخشەکانم جێبەجێ بکەین.

- چۆن؟

- ئاها... ئەگەر بمەوێت (جلە کەرەکە)ی لێ بکڕم شک دەخات... ئەبێ کەرەکە بکڕم و هەر کە چەند مەترێک دوور کەوتمەوە (جل)ەکە لە کەرەکە دەکەمەوە، کەرەکە لە

بیابان بەرەڵا دەکەم. ئێستە تۆ لەم کابرایە بپرسە کەرەکەی بە چەند دەفرۆشێ؟ کابرای لادێی پێشدەستی کردو پرسی:

- ئەم کابرا بێدینە ئەڵێ چی هەر (فینگە فینگ) دەکات.

- هیچ بابە!. خۆشیی لە کەرەکەت هاتووە ئەیەوێت بیکڕێت.

کابرای دێهاتی دەنگێکی تایبەت لە دەمی هاتەدەر:

- حەیف بە ڕاستی ئاشکرا بوو ئەم کەرەی من زۆر شەریفە ئەگینا بۆچی ئەم کابرایە مرخی لێخۆش کردووە.

- بۆچی؟

- ئەم کابرایە دەیەوێت چی لەم کەرەی من بکات؟

- تۆ هەقت بەسەر ئەم کارەوە چییە؟. مەگەر جگە لە نرخی کەرەکەت شتێکی ترت دەوێ؟

کابرای دێهاتی پرسی:

- ئەم کابرایە خەڵکی کام وڵاتە؟

- ئەمریکا.

- هۆ! بۆچی لە وڵاتی خۆیان کەر نییە؟

- بابەگیان ئەم قسانە چییە ئەیکەیت بۆچی کڕین و فرۆشتنی کەر تێکەڵ بە سیاسەت دەکەیت... تۆ ئەتەوێ

کەر بفرۆشی ئەم کابرایەش ئەیەوێت بیکڕێت... ئیتر بۆچی ئەمبەرو ئەوبەرمان پێدەکەیت.

- نەخێر کاکە ئەم کەرە بە کەڵکی ئەم کابرایە نایەت.

- بۆچی؟

- ئەم کەرە پیرو پەککەوتووە.

قسەکانیم بۆ پرۆفیسۆر وەرگێڕا زۆر خۆشحاڵ بوو گوتی:

- لەوانەیە هەرزان بیدات نرخەکەی لێبپرسەو زوو تەواوی کە.

بە لادێییەکەم گوت:

- گرنگ نییە... حەزی لێدەکاتو دەیەوێت بیکڕێت.

- نەکاکە نەنگە.. کاتێ گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی ئابڕومان ئەبات!

بە پرۆفیسۆرم گوت، پێکەنیو گوتی:

- ئەم لادێییانە پاکو دروستکارن پێی بڵێ لەبەر خاتری دڵ پاکییەکەی ئامادەم پارەی زیاتری پێ بدەم.

بە لادێییەکەم گوت:

- ئەمریکییەکە رازییەو قسەیەکی نییە!

- نەخێر... ئەو تێناگات... ئەم کەرە لاشەی بریندارەو بە کەڵکی نایەت.

- بۆچی!...کابرا پارەی بەلاشی هەیە ئەیەوێت کەرەکەت لێ بکڕێت.. بۆچی ئەوەندە چەنە ئەدەی؟

- لەعنەت لە شەیتان... ئاخر ئەم کەرە پیرە نەخۆشە بە کەڵکی چی دێ؟

- خۆشەویستم تۆ (کاڵەک خۆری یان بێستان رنی)[1] تۆ پارەت ئەوێت کارت بەمانە چییە؟ بڵێ نرخەکەی چەندەو کارەکە تەواو بکە.

کابرای لادێی بە ناڕەحەتییەوە سەری باداو گوتی:

- وەڵڵاهی مرۆڤ لە ئاکاری ئەم ئەمریکاییانە دڕدۆنگ ئەبێ، لێی بپرسە لە وڵاتی خۆیان کەر نییە... بۆچی ناچێت لەوێ بیکڕێت؟

قسەکانیم بۆ پرۆفیسۆر تەرجەمە کرد (گوتی بڵێ زۆر هەیە، بەڵام لەم جۆرە پەیدا نابێ)

لادێییەکە شانەکانی بەرزکردەوەو گوتی:

- زۆرباشە، من هەموو عەیبو ناتەواوییەکانم پێ گوتی بەیانی نەچیتەوە زەممان بکەیت! نەڵێیت دەستبڕن... من بەم مامەڵەیە رازیم نیم، بەڵام نامەوێت دڵت بشکێنم میوانی ئێمەی قسەیەکم نییە...

---

[1] دەربڕینی وەرگێڕ

لەبەر ئەوەی مامەڵەکەمان خەریك بوو جۆر نەبوو پرۆفیسۆر لە خۆشیدا خەریك بوو شاگەشکە دەبوو.

پرسیم:

- زۆرباشە چەندت پێ بدەین؟
- لەبەر خاتری ئێوە (٥٠٠٠) لیرە
- وتت چی... بۆچی شێت بوویت، باشترین ئەسپی عەرەبی لەم وڵاتەدا سێ چوار هەزار لیرە نرخیەتی!. بۆچی چ باسە.

کابرا دێهاتییەکە بە خۆینساردییەوە وەڵامی داوە:

جا کەوایە کەری منت بۆ چییە برۆ ئەسپێکی عەرەبی بکڕە!.

بە ئەمریکییەکەم گوت کابرا داوای (٥٠٠٠) لیرە دەکات. لە جێی خۆی وشك بوو گوتی:

- ئەموت کە.نرخی شتێ لەم لادێییانە دەپرسی ئاوا وەڵامت دەدەنەوە، ئێستە چی بکە ئەڵبەت زۆر زیاتر دێنێ، بەڵام ئەترسم ئەگەر رازی بین دەبەمان پێبکات... ئەبێ مامەڵەی لەگەڵ بکەین.

بەکابرا لادێییەکەم گوت:

- بابەگیان راست بڵێ ئەم کەرەت بە چەند کڕیوە؟
- من مرۆڤێکی درۆزن نیم... راستییەکەی ئەوەیە من ئەم کەرەم بە خاتری پێستەکەی بە پێنج لیرە کڕیوە،

چون خۆی بە کەڵکی هیچ نایەت، ئەمڕۆو سبەی ئەمرێ منیش پێستەکەی دەرینەمو چەرمی لێ دروست دەکەم.
شێوازێکی راستیم بە قسەکانم داو گوتم:

- ئەڵێن (ویژدان نیوەی ئیمانە!. تۆ کە مرۆڤێکی مسوڵمانی چۆن ئەتەوێ کەرێ کە بە پێنج لیرەت کڕیوە بە پێنج هەزار لیرە بیفرۆشی؟.

کابرای دێهاتی بە خوێنساردییەوە گوتی:

- بابە گیان من شەڕ ناکەم، من نامەوێت کەرەکەم بفرۆشم. ئێوە زۆرم لێدەکەن مامەڵەتان لەگەڵ بکەم... وتم پیرە رازی بوون. ئەها راستی شتێکم لەبیر چوو بوو قاچی چەپی شەلە.

- باشە...

- ئێستە دیت؟ .ئێوە کە بەو جۆرە ئەتانەوێت ئەم کەرەی من بکڕن خۆیشم کەوتوومەتە گومانەوە... لەوانەیە ئەم کەرە خاسیەتێکی باشی هەبێ وا ئەم خاریجی بێدینە بە هەموو عەیبێکەوە ئامادەیە بیکڕێت... بە هەر حاڵ براکەم من دەبەتان پێناکەم، شتێکم گوتو بڕایەوە...خێری لێ ببینن.

بە پرۆفیسۆرم گوت:

- کەمتر نایدات پارەکەی بدەرێو با بڕۆین سەرمان رەحەت بێت!

- نه گیانەکەم... چی بدەم.. بۆچی تەماعی ئەم لادێییانە سنوری هەیە! پێنج هەزار لیرە بدەم خێرا دەبەمەمان پێدەکاتو دەڵی دە هەزار لیرە...

- باشە چی بکەین؟

- مامەڵە بکە...

- بێ سودە...

- با وا نیشان بدەین کە وازمان لە کەرەکە هێناوە...

- خراپ نییە.. کاتێ بزانێ دەمانەوێ بڕۆین بانگمان دەکات. لەم کاتەدا کە هەوڵمان دەدا خۆمان ئاسایی نیشان بدەین خواحافیزیمان کردو گوتم:

- زۆرباشە ئاشکرایە ناتەوێ بیفرۆشی، سەربەستی.. خواحافیز..

- بەخێر چن... خوا ئاگای لێتان بێ.

بینیم کابرای لادێیی هیچ گرنگی نادات بەوەی کە ئێمە دەمانەوێت بڕۆین کاتێ کەوتینە ڕێ گوتم:

- لەقە لە بەختی خۆت مەدە... جگە لەم خاریجییە شێتە کەس ئامادە نییە پارەیەکی وات بداتێ.

کابرای لادێیی بە خوێنساردییەوە گوتی:

- هەرچی ڕۆزی مرۆڤ بێت پێدەگات!.

دوو سێ هەنگاو ڕۆیشتین.. دیتمان سوودی نییە گەڕاینەوە.. کابرای لادێیی پێکەنینێکی تایبەتی کردو گوتی:

- دەمزانی دەگەڕێنەوە؟.

هیچی نەوت، بەڵام پێکەنینەکەی هەزار واتای ئەدا، باسەرتان نەیەشێنم.. دوای دوو سەعات مامەڵەو چەنە لێدان بە (٢٥٠٠) لیرە کۆتایم پێ هێنا... پارەکەم دا بە کابرای لادێیی بە وردی ژماردیو خستییە گیرفانییەوە، دواتر (جلە)کەی لەسەر پشت لابردو هەوسارەکەی دا بە دەستمان گوتی (خێری لیببینی... خۆش هاتن) چاوەکانی پرۆفیسۆر خەریك بوو دەرئەپەڕین. بە دیقەتەوە تەماشای (جلە کەر)ەکەی دەکرد! ئەتوت جادوی لێکراوە قاچەکانی وەك بزمار بە زەویدا داکوترابوون..

کابرای لادێیی تەماشایەکی قەدو باڵای پرۆفیسۆری کردو بەگاڵتە پێکردنەوە گوتی:

- بێچارە لەخۆشیا وشك بوو، وەکو کەسێ (هەنگی لە گوێزدا دۆزیبێتەوە) * زۆرباشە، خەیاڵی خراپ مەکە.((من پیاوم پیاویش لە قسەی خۆی پاشگەز نابێتەوە))... بیبە خێری لێببینی...

پرۆفیسۆر بە هێواشی لە منی پرسی:

- ئێستە تەکبیرمان چییە؟
- وەڵڵا نازانم...

---

* دەربڕینی وەرگێڕ

- ئاگات لێی بێ تێ نەگات! کەمێك ئەڕۆین دواتر ئەگەڕێینە دواوە پێی ئەڵێن کەرەکەمان سەرمای دەبێ ئەو جلەمان بدەرێ بیدەین بەسەر پشتیا، لەغاوی کەرەکەم گرتو کەوتمە ڕێ پرۆفیسۆر لە دواوە پاڵی دەناو من لە پێشەوە رامدەکێشا، بەڵام هەرچەند زۆرمان لێدەکرد لەجێی نەدەجولا، کەرەکە پیر بوو توانای ڕێگە رۆشتنی نەبوو قاچەکانی ئێمەش ڕێیان لەبەر نەدەڕۆیشت.

ئەگەر بمانتوانیایە (جلە)کەمان لەدەست کابرای لادێی دەربهێنایە کەرەکەمان بەرەڵا دەکردو ئەچوین بەڕێی خۆمانەوە.

لەکۆتاییدا بەهەرحاڵێ بوو کەرەکەمان چەند هەنگاوێك بردە پێشەوە کابرا لادێییەکە لە دواوە بانگی کرد:

- راوەستن شتێك بەجێ ماوە.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

- خوایە... چەند باش بوو... ئێمە هیچمان نەگوت کابرا ئەیەوێ جلەکەمان بداتێ...

هەردووکمان شادو خۆشحاڵ گەڕاینەوە، کابرای لادێی هاتە لامان و گوتی:

- نەقیزەکەتان لەبیر چوو... ئاشکرابوو ئێوە زۆر ناشین و نازانن کەر بەبێ نەقیزە ناچێ بەڕێوە!

نەقیزەکە کە سەرێکی حەڵقەیەکی پێوە بوو لە پیاوە لادێییەکەم وەرگرت... پرۆفیسۆر تاقەتی چووبوو گوتی:

- خێراکە کارەکە تەواو بکە... لەگەڵ ئەمانە ناکرێ قیلێ بکرێ.

بە پیرەمێردە لادێنییەکەم گوت:

- ئەم کەرە زۆر لاوازو نەخۆشە! پیرە... لەکار کەوتووە، لەوانەیە سەرمای ببێت... گوناهە... ئەو جلەم بدەرێ بیدەم بەسەر پشتیا.. ئەو جلە کۆنەو پیسە بەکەڵکی تۆ نایەت...

کابرای لادێیی سەرێکی لەقاندو گوتی:

- بەکەڵکی هیچ نایەت، بەڵام ئەگەر سەنگ بایی خۆی ئاڵتونم بدەنێ نایفرۆشم!.

- بۆچی؟

- بۆچی ناوێت!. هی فرۆشتن نییە.!: ئەمە یادگاری باپیرانمە. لە پازدە پشتەوە بە میرات بۆم ماوەتەوە ناتوانم یادگاری خێزانی بفرۆشم.

قسەکانیم بۆ پرۆفیسۆر وەرگێڕا زۆر نارەحەت بو و گوتی:

- ئەم گاڵتە جاڕییە چییە؟.. (جلە کۆنەیەك نابێتە هۆی شانازی خێزانی)

ئەمجارە کابرای لادێیی تۆڕە بوو، وەڵامی دایەوە:

- ئێمە بیستبوومان ئەم خاریجیانە مرۆڤی باشن و کارییان بەکاری کەسەوە نییە، چ پەیوەندییەکی بەوەوە هەیە یادگاریی خێزانی من بەنرخە یان بێ نرخ ئەو لە من

کەرێکی کڕیوەو پارەی خۆی داوەو کەریشی وەرگرتووە ئیتر بڕۆن بەدوای کارتان گۆڕتان ون کەن!.. بیەڵن ئێمەش دوای کاری خۆمان بکەوین... من نازانم ئەم (جلە) چ بایەخێکی هەیە. هەرکات بیخەمە سەر پشتی کەرێکی پیرو پەککەوتەو لەکار کەوتوو خێرا مشتەری بۆ پەیدا دەبێ ئەفرۆشرێ، ئەم پێنج ساڵە تاقیم کردۆتەوە هەموویشی ئەم خاریجیانە ئەیکڕن!!.

ترسام پڕۆفیسۆر جەڵدە لێی بدات، بەهێواشی قۆڵیم گرتو کەوتینە ڕێ چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبووینەوە پیرەمێردە لادێییەکە لەدواوە بانگی کرد:

- ئەزانم ئەم کەرە بەکەڵکی ئێوە نایەتو لە نیوەی ڕێ بەرەڵای دەکەن... بەخۆڕایی من ئەزیەت مەدەن. هەر لێرە جێی بیەڵن تا.. من (جلەکەی بخەمەوە سەر پشتو بەکەرێکی دیکەی بفرۆشم) کەرەکەمان بەرەڵا کردو چوین بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە پڕۆفیسۆر گوتی:

- من لادێیی زیرەکم زۆر بینیوە، بەڵام ئەمەیان شتێکی دیکە بوو.

سوار ئۆتۆمبیلەکە بووین.. هێشتا نەقیزەکە بەدەست پڕۆفیسۆرەوە بوو توند لەدەستیا گرتبووی، پرسیم:

- ئەو پارچە ئاسنە بە کەڵکی چی دێ؟

پێکەنیو وەڵامی داوە:

- ئەمە بە ناونیشانی یادگاریی وەکو شتومەکە ئاسارەکان هەڵی ئەگرم. نەقیزەیەکی بەنرخە... ئەمیش ئەبەم تا بە ناونیشانێك لە مامەڵەی ئێوە نیشانی بدەم.

بەڵێ برادەر ئەبێ تا زووە بیرێك لەم کارە بکەینەوە ئێستا بینین هەق بە منە نارەحەت بم... ئابڕومان چوو بێچارە بووین ئەویش لەبەر چی... لەبەر (کەر).

*******

## ڕێگەو ڕەوشی کاسبی [٦]

ئاغا مارویك خاوەنی میکانییەکی گەورەی شارەکەمانە، کەم کەم خەریك بوو پیر ئەبوو. حەزی ئەکرد هەرچی زووە ڕێگەو ڕەوشی کاسبییەکەو هونەرو فەنی کارەکەی بە کوڕەکەی بڵێ.

ڕۆژێ لەگەڵ کوڕەکەی چوونە ناو دەفتەرەکەی... دەرگاکەی لەدواوە داخستو گوتی:

- وەرە کوڕم دانیشە... ئەمڕۆ ئەبێ نهێنی کارەکەم بە تۆ بڵێم، ڕاستە تۆ دوو ساڵە لەگەڵ من کار دەکەی، بەڵام زۆر شت هەیە هێشتا سەری لێ دەرناکەی، ئەوەی من ئەمەوێت پێت بڵێم شتێك نییە لەناو قوتابخانە

[٦] لەرۆژنامەی شارەزوور بڵاوکراوەتەوە

بیخوێنرێ... ئەوانە ئەبێ لەنێو قوتابخانەی کۆمەڵدا فێری بی..

کوڕەکەی ئاغا مارویك تێگەیشت کارەکە زۆر گرنگە! بەدڵنیاییەوە باوکی ئەیەوێت قسەی تازەی بۆ بکات! گوتی:

- بابە گیان من لەم ماوەیدا هەموو شتێك بە باشی فێر بووم.
- نە.. گیانەکەم. تۆ هێشتا هیچ شتێ فێر نەبوویت، پێویست ناکات وەڵامم بدەیتەوە... ئەمڕۆ تەنها گوێ بگرە.. ئەمەوێت نهێنییەکانی کارەکەت بۆ ئاشکرا بکەم...
- فەرموو بابە گوێم گرتووە.
- یەکەمین شت کە لە هەموو دامەزراوەیەکی بازرگانیدا پێویستە لەبەرچاو بگیرێ رێکخستنی بوودجەیە...

هانریك دوازدە ساڵ دەرسی خوێندبوو... ئەیزانی بوودجە چییە، بەڵام تێنەدەگەیشت رێکخستنی بوودجەی میکانییەك چ سودێکی هەیە؟ ئەو تەنها بیستبووی لە سەرەتای هەر ساڵێك دەوڵەتو دامەزراوەکان بوودجە دابەش ئەکەن لە روی حسابی دەرامەتییانەوە خەرجیو زیان لەبەرچاو ئەگرن. پرسی:

- بابەگیان تەعمیرگاو میکانیکی چ بوودجەیەکی پێویستەو بەچ شێوەیەك ئەتوانی بوودجە رێك بخەی؟
- چۆن پێویستی نییە؟

- ئاخر ئێمە لەکوێ ئەزانین لەماوەی هەفتەیەك، یان ساڵێ، یا مانگێ چەند ئۆتۆمبیل خراپ ئەبێ کامیشیان بۆ لای ئێمە دێ تا لەڕوی دەستکەوتو خەرجییەوە بوودجە ڕێك بخەین؟

ئاغا مارویك پێکەنینێکی ماناداری کردو گوتی:

- وانییە! هەڵەی تۆ ئەمەیە! هەر ئەمانەشە ئەمەوێت ئەمڕۆ پێت بڵێم! کوڕی خۆم ئەگەر بڕیار بێ دانیشیت تا ئۆتۆمبیلێك خراپ بێتو بێت بۆ لای تۆ لەبرسا دەمری!!

- بۆچی ڕێگەی تری هەیە؟

- هەڵبەت کە هەیەتی... گەر نەیبووایە ئەمڕۆ من باشترین میکانیکی شار نەدەبوومو ژیانی ئێمە وا بە باشی بەڕێوە نەدەچوو!

- کاری ئێوە باشە بۆیە خەڵك زۆربەی بۆ لای تۆ دێت!

- نە..کوڕم.. زۆر بوون شارەزاییان لە من زیاتر بوو، بەختو بۆهاتیشیان لێ گەڕێ... ئەمڕۆژانە ئەو جۆرە قسانە کۆن بوون! هەرکارێك ڕێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە... چونکە من ڕێگەی کارەکەم باش ئەزانم بەرەوپێش چووم... باپێت بڵێم.. بە ڕاستیو دروستی ئەستەمە کەسێ لە ژیان سەرکەوتوو بێ! هەر کەسێکت بینی لە کەسانی تر پێشکەوتووتر بوو بەدڵنیاییەوە کەڵەکێك لەکاریدا هەیە! ئێستاکە من پیربووم توانای کارم نەماوە

پێویستە نهێنی کارەکەمت بۆ باس بکەم بەو مەرجەی پەیمان بدەی جگە لە کوڕەکەت بۆ کەسی باس نەکەیت.

هانریك ئەیزانی باوکی کەسێ نییە قسەی بێ جێی بکات نەمە لەلایەکەوە نەیشی ئەتوانی ئەوە قبوولێ بکات!

لەحاڵێکدا هەموو گیانی کردبووە گوێ گوتی:

- فەرموو بابەگیان... گوێم گرتووە.

ئاغا ماروێك کەمێ بێدەنگ بوو گوتی: لە زەمانی زوودا وەستایەك هەبوو هەرکات ئەچوو بۆ چاککردنی ماڵی خەڵك ئەو جێگەیەی خراپ ئەبوو چاکی ئەکرد، بەڵام خشتەکانی شوێنێکی دیکەی بەشێوەیەك ئاڵوگۆڕ پێ دەکرد دوای پازدە رۆژی تر پێویستی بە چاکردنەوە ئەبوو! خاوەن ماڵ دوای مانگێك ناچار ئەبوو بگەڕێ بەدوای وەستادا!

ئەمجارە وەستا شوێنێکی تر خراپ ئەکات.. بەم جۆرە ساڵ دوازدە مانگە کار ئەکات و هیچ کات بێ کار نابێ... لەکارەکەی ئێمەشدا پێویستە بەتەواوی ئەم یاسایە پیادە بکرێ گەر ئێمەش بەم جۆرە کاربکەین ئەوا هەم مشتەری لێمان مەمنون ئەبێ هەم پارەیەکی زۆر بەدەست دێنین! تێگەیشتی؟

- بەڵێ بابە تێگەیشتم!

- سەرەنجام تەنها لەم رێگەیەوە ئەتوانی ژیانی خۆت دابین بکەیت! ئێستە لەوانەیە بتەوێ بزانی رێ و رەسمی

کارەکە چۆنە؟ کاغەزو قەڵەمێك بگرە بەدەستەوە تا پێت بڵێم!

هانریك کاغەزو قەڵەمی هێنا...

- فەرموو بابەگیان.
- بنوسە... ئەڵبەت ئەزانی مشتەری دایمی ئێمە کێیە؟
- بەڵێ! هەموویان ئەناسم! لە هەموویان زیاتر دوکتۆر نەجاتی دێت بۆ لامان!
- ئیتر کێ؟
- سەعادەت الدین.
- راستە، کێی تر؟
- ئەندازیار سەلمان بێ!
- ئۆهۆ... زۆری نەمابوو ئەوەی لە هەموویان گرنگترە فەرامۆشی بکەی!
- کێیە؟
- ئەو خانمەی زۆر شیك پۆشە... ناوی چییە؟
- شوکران خانم؟
- بەڵێ... ئەویش بنوسە...جگە لەویش هیی دیکەمان هەیە. هەرکات هاتەوە بیرمان ئەینوسین... ئێستە گوێم بۆ بگرە.. ئۆتومبیلەکەی دوکتۆر نەجات لە مانگی ئازاردا دووبارە دێتەوە بۆ لامان!
- چۆن ئەزانی بابە؟

- پف.. من هەر لەکاتی لەحیم کردنی رینگی پێشەوەی هێواش لاستیکی بستۆنی هایدرۆلیکەکەیم کون کرد.. ئێستە دڵنیات دەکەمەوە پاش هەفتەیەکی دیکە بۆ گۆرینی لاستیکی بستۆنەکە دێتەوە لامان!!
- کەم...کەم... خەریکە تێدەگەم!
- ئێستا نەجاتی لە مانگی ئازار (٨٠) لیرە بنوسە... لە مانگی ئایاریش بۆ گۆڕینی دیشلی فلاونەکەی سەردانمان ئەکاتەوە چون بەجۆرێ توندم کردووە لە مانگی ئایار خراپ ببێت.. حسابی ئەویش (٦٥٠) لیرە بنوسە.
- نوسیم بابە.
- لە مانگی حوزەیرانیش بووشەکانی دەگۆڕێ لەبیرت نەچێ بابە ئەندازەی سەرە نینۆکێ بووشی دووەم نەچێتە جێگەی خۆی چونکە ئیدی پلاکی چاوی دووەم ئیش ناکات بۆ گۆڕینی دێتەوە بۆ لامان. ئەو کاتەی بووشی دووەم دەگۆڕی لەبیرت نەچێ پولی ملی کرنگ شل بکەرەوە.
- بەسەرچاو بابەگیان.. لەبیری ناکەم.
- بەگشتیی تا کۆتایی ساڵ ٢٣٠٠ تا ٢٤٠٠ لیرە لە دوکتۆر نەجاتی وەر دەگرین! ئەمجار نۆرەی سەعادەت الدین... قەباغی سەر تابتەکانی خراپ بووە.. هەموو مانگێ

واشەرێك خراپ دەكات ١٨٠ لیرە بۆ گۆڕینی هەرجاری واشەرەكەی، بەڵام لەبیرت نەچێ هەركات واشەرەكە ئەگۆڕی لەكاتی بەستنەوە لێ گەڕێ با دوو دانە لە سەمونەكانی شل بێت‌و زۆر توندیان نەكەیت...تێگەیشتی!

- بەڵێ تێگەیشتم...
- ئەگزۆزی ئۆتۆمبیلەكەی سەعادەت الدين بە بەردەوامی ئەشكێ مانگی دوو جار بۆ چاكردنی ئەگزۆز دێتە لامان! تا ئاخری ساڵ بۆ گۆڕینی واشەرو چاكردنی ئەگزۆز نزیكەی ١٨٠٠ لیرەی ئەویش بنوسە!
- نوسیم بابە!
- دواتر سەرەی كێیە؟
- مسیۆ ئەندریاسیش هەیە؟!
- ئەها...بەڵێ... ئۆتۆمبیلی مسیۆ ئەندریاس بە بەردەوامی دانی دیشل ئەشكێنێ كاتێ چاكی ئەكەیت‌و گریسی ئەكەیت كەمێ لم بكە ناو گریسەكە... لەكاتی سوڕاندا تێكەڵ ئەبێ‌و دانەكانی لێك گیر ئەكات‌و ئەیشكێنێ! لەبیرت بێ هەركات چویتە بازاڕ پڕ كیسەیەك لم لەگەڵ خۆت بهێنە كیسەیەك بەشی ساڵێكت ئەكات. ئێستا نۆرەی (سەلمان بی)یە.
- بەڵێ ئەویش ئەناسم!

- ئاگات لێ بێ سەلمان بی یەکێکە لە باشترین مشتەرییەکانی ئێمە.! بۆ ئەویش (٩٣٠٠) لیرە بنوسە.. نیگەران مەبە ئەو حاڵی زۆر باشە! ئۆتۆمبیلەکەی ئەویش لەژێر پلاکەکانی رۆن دەردەکات باش ئاگر ناگەیەنێ.. کاتێ هاتە لات سوێند بخۆ ئەبێ وەلفەکانی کەوەرەکە بگۆڕیت... بۆ گۆڕینی وەلفەکان پێویستە شەوێك لات بمێنێتەوە تۆش خێرا گێڕەکەی بکەرەوەو بزمارێکی بچوك بخەرە ناوی‌و قەباغەکەی ببستەرەوە... لەدوای دوو سێ رۆژ بزمارەکە هەموو دانی دیشلییەکانی ئەشکێنێ کاتێ هاتە لات بە جۆرێ خۆتی نیشان بدە لەو پێشهاتە زۆر نارەحەتی... بۆ گۆڕینی گێڕەکە ٣٥٠٠ لیرەی لێ وەردەگری تێگەیشتی؟
- بەڵێ...
- ئێستا نۆرەی شوکران خانمە... ئەو بەو جۆرە نییە؟
- بەڵێ...
- بۆ شوکران خانم ٢٨٠٠ لیرەو...، بۆ حەقی بەگ ٢٥٠٠ لیرە، بۆ لیئۆن ٧٠٠ لیرەو بۆ عەبدوڵڵا بەگ ٥٠٠ لیرەو.. زۆر باشە ئێستا کۆی بکەرەوە بزانە ئەکاتە چەند؟
- بابەگیان. (سفرو سفر هەر سفر شەش‌و حەت ئەکاتە سیازدە... سێ یەك بەدەستەوە) هەمووی دەکاتە نزیکەی بیست هەزار لیرە..

- بەڵێ... تەواوی خەرجی ساڵانەی تۆ دەکاتە نزیکەی(١٥٠٠٠) لیرە ئێستا پێنج هەزار لیرەش پەزمەندەت دەمێنێ‌و کاری رۆژانەش هیچ نەبێ ساڵانە دەگاتە ١٥٠٠٠ لیرە... تۆ ئەگەر مەسروفی زیادەت بۆ بێتە پێش لە ٥٠٠ لیرە تێپەڕ ناکات.
- مەسروفی زیادە چییە؟
- پێویستە ئەوەش بزانی دامەزراوەیەك خەرجی زیادەشی دەبێ وەك شاگردانەو... بەقەرزدان‌و خەرجی مشتەری‌و... ماڵیات‌و... بەمجۆرە ئەتوانی موحتاجی کەس نەبی‌و تا ئاخری ساڵ بەخۆشی رابووێری! بەڵام ئەگەر بتەوێ ویژدان بخەیتە کارو مرۆڤایەتی پەیڕەو بکەیت وەکو کەسانی تر هەمیشە برسی دەبی!.

********

## بۆ خۆشیان نازانن لەسەرچی شەڕ دەکەن[٧]

پاسەکە تا دەم دەرگاکەی پڕ کردبوو. ئەگەیشتە هەر وێستگەیەك هەمدیسان خەڵکی سوار دەکرد، بە پێوەش جێگە نەمابوو، چونکە دونیا تەم بوو خەڵك لەترسی ئەوەی بارانیان لێ داکا. حەملەیان ئەکردو لەناو دەرگاکە ئەگیران لە میلەکان. شاگردی شۆفیرەکە بەردەوام هاواری ئەکردو ئەیگوت:

- بلیت... بەبێ بلیت سوار نەبن.

بەڵام کێ بەکێ بوو... نەفەرەکان ئەوەندە پەلەیان بوو لەبیریان ئەچوو بلیت ببڕن!

شاگردەکە لەو بابەتانەی چەند جاران دیبوو. لەگەڵ ئەو هەموو جەنجاڵییەدا بێ بلیتەکانی ئەناسی:

- مامەگیان بلیتەکەت!

[٧] لەژمارە ١١ ڕۆژنامەی شارەزوور بڵاوکراوەتەوە

- براگیان لەبیرت نەچێ بلیتەکەت بدە.

لەبەشی دواوەی پاسەکەدا نەفەرێك هەوڵی ئەدا خۆی لەبەرچاوی شاگردەکە ون بکات، لەوانەیە واش نەبووبێ، بەڵام بە بۆچوونی شاگردەکە وابوو کە بلیتی لە کابرا وەرنەگرتووە!

پیاوەکە جلوبەرگێکی ڕێکوپێکی لەبەردا بوو... کڵاوێکی شاپۆی تازەی لەسەر بوو... بۆینباخەکەی خاریجی بوو... لە بڕۆو سمێڵی قەترانی وادیار بوو پیاوێکی بە شەخسیەتە.

بەڵام شاگردەکە دڵی رازی نەبوو، لەژێرەوە تەماشای ئەکرد. بەتایبەت کە ئەم نەفەرە غەریبە بوو، بۆ یەکەم جار بوو لەم هێڵە بەرچاوی کەوتبوو، چونکە شاگردەکە زۆربەی نەفەرەکانی ئەناسی، ئەیزانی کێ لەچ کاتو لەکام وێستگە سوار بووەو لەکام وێستگە دائەبەزێ.

لەدڵی خۆیدا لێکی ئەدایەوە غەریبەیەکی کڵاوبەسەر واز لێبێنێ!.

لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بەقسەکردن:

(دەی با پشکنەر بێ؟.. هەرکەس هەیە با ببێ من وەزیفەی خۆمە هەرکەس سواربێ بلیتی لێوەرگرم).

دووبارە بە بیانوی ئەوەی بەنەفەرە تازەکان ئەڵێ، بەرزتر هاواری کرد:

- بلیت کاکە... بلیتەکەت لەبیر نەچێ ئەوانەی لەدواوە دانیشتون لەبیرتان چوو بلیت بدەن!

دووباره یارۆ وەکو خەیاڵی نەبێ، بەتەواوی ڕۆی بۆ لای پەنجەرەکە سوڕاند. شاگردەکە چاوی پەڕییە تەوقی سەری، دەستی کرد بە قرە قڕ: (پیاوی باش ناتوانی گۆڵ لە من بکەیت... تۆ هەرکەس بیت ناتوانی لەدەست من ڕزگار بی!)
دواتر کەمێ خۆی کێشایە پێشەوەو بە توندی لەوی پرسی:
- ئاغای خۆشەویست تۆ بلیتت پێیە؟
هەمدیسان کابرا بەسەر خۆی نەهێنا، لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو دەستی بە فیکە لێدان کردو بە فیکە وەڵامی شاگردەکەی دایەوە، بە جۆرێ دەمی ئەجوڵاند وەك بڵێ (کەر کوڕی کەر من باج بە تۆ نادەم) یان (تا ئێستا پێشینەی نییە بلیتی پاسم بڕیبێ).
شاگردەکە بە ئەندازەیەك توڕە بوو بوو تاکو ئێستا بەخۆیەوە نەدی بوو، گەر چەقۆت لێبدایە خوێنی لێنەدەهات لە دڵەوە گوتی:
(ئەگەر پیرەژنێك بووایە، گەر پیرەمێردێم یا کەمئەندامێك یا گەدایەك بووایە قەی نەدەکرد، بەڵام پیاوێك بەو مل ئەستوورییە چۆن ئەبێ پارەی بلیت نەدا!؟) لەگەڵ ئەو هەموو توڕەییە هاواری کرد:
- ئاغا بلیتت لەبیر نەچێ... کاکی بەڕێز لەگەڵ تۆمە.
لەگەڵ وتنی ئەم ڕستەیە لەژێرەوە تەماشای ئەوی ئەکرد. پیاوەکە پێکەنینێکی عەجیبی کرد... پێکەنینەکەی شێوە گاڵتەکردن

بوو... شاگردەکە بەتەواوی ئارامی نەما (هەرچی ئەبێ با ببێ) بڕیاری دا کارەکە یەکلا بکاتەوە بەتەواوی بەرەو ئەو هەنگاوی ناو بەدەست شانی راتەکاندو پێی گوت:

- برای بەڕێز لەگەڵ تۆمە!

پیاوەکە وەکو کەسێکی تورە روی وەرگێڕاو پرسی:

- چییە؟ ئەڵێی چی؟ ئەمە چ جۆرە قسەکردنێکە لەگەڵ خەڵکدا؟ بۆچی شانم رائەتەکێنی؟

شاگردەکە هەر وەکو ئیهانەی پێکرابێ خۆی کۆکردەوەو بە دەنگێکی ئارامتر گوتی:

- برای بەڕێز ئەکرێ بلیتەکەت ببینم؟

پیاوەکە تەماشایەکی قوڵی شاگردەکەی کردو لەژێر لێوەوە گوتی:

- لاحەولە وەلا...؟) پاشان روی بۆ لای جامەکە سوڕاندو سەرگەرمی تەماشاکردنی شەقامەکە بوو.

شاگردەکە مەسەلەکە تێگەیشت، دڵنیابوو لەوەی بلیتی لەو پیاوە وەرنەگرتوەو فێڵبازە، ئێستە ئیتر بەم تورپییەوە ئەیویست مەسەلەکە یەکلا بکاتەوە... بەڵام بۆچی خۆی کەڕ کردووە! من لەوانە نیم بەم فشەو هاش‌و هوشە واز بێنم! ئەگەر بەڕێوەبەری گشتیی بێت‌و داوام لێبکات وازی لێبهێنم! واز لەم کابرایە ناهێنم. ئەو هێشتا نازانێ کێ رەقیببیەتی!

لەژێر کاریگەری ئەم هەموو تورەییەدا دووبارە شاگردەکە هێزی دایەوە بەرخۆیو بەهەمان شێوە روی کردە کابراو بەرزتر هاواری کرد:

- پێم وتی بلیتەکەتم پیشان بدە!

کابرا هەمدیسان بە تورەییەوە روی وەرگێڕاو زۆر بە ڕاشکاوانە گوتی:

- دەست بە ڕوی مندا بەرز مەکەرەوە.
- بلیتەکەت.

کابرا نەیهێشت شاگردەکە قسەکەی تەواو بکات گوتی:

- کەڕ نیم! ئەبیستم! ئەم هەموو هاوارە دەکەیت. ئەگەر بلیتم پێ نەبێت سوار نابم؟ کابرایەکی تر کە ئاگای لەم بەزمە بوو ئاکاری شاگردەکەی بە ئیهانەی نەفەرەکان دەزانی گوتی:
- راست دەکات، ئیتر... لە شاگرد شۆڤێرێك لەوە زیاتر چاوەڕوان ناکرێت! شاگردەکە لەم رستە توانج ئامێزە زۆر نارەحەت بوو گەڕایەوە بۆ لای کابرای دووەمو گوتی:
- یەکەم شاگرد شۆڤێری چییەو چۆن جوێن ئەدەی، دووەمینیش چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە وا لە کاری خەڵك خۆ هەڵئەقورتێنی!!
- وەکو ئەوەی لە کاری سەفیری نێودەوڵەتی قسەم کردبێ... شاگردێك بۆی نییە ئەم قسانە بکات!

لەولاترەوە کابرایەکی کرێکار وەستا بوو. هێشتا بلیتەکەی لەنێو دەستی بوو لەم قسەیەی کابرا زۆر نارەحەت بوو بە تورەییەوە گوتی:

- بۆچی تۆ کێتو خۆت بە چی ئەزانی وا ئەوت بە لاوە پەسەند نییە؟

کابرا دووەم سوور هەڵگەڕاو وەڵامی داوە:

- هەر کەسێکم پەیوەندی بە تۆوە نییە...!

کابرای کرێکار لەجێی خۆی وشك بوو خۆی کۆکردەوە، بەڵام کەسێکی تر کە لە پشت ئەوەوە وەستا بوو وەك پریشکی ئاگر پەڕییە ناوەڕاستو گوتی:

- ئێوە وا دەزانن کابرا هەر ئەوەندە بۆینباخێکی بەست ئیتر خاریجییە؟

لەولاترەوە کابرایەك کە بۆینباخی بەستبوو چووە نێو شەڕەکەوەو گوتی:

- ئەوە لەسەر میراتی باوکتان شەڕ ئەکەن؟

نەفەرێکی بازاڕی وەڵامی داوە:

- نە... لەسەر کەسایەتی ئێوە شەڕ دەکەین!

- مانای چی؟

- یانی ئەوەی ئێوە وادەزانن کە ناتانناسین لە قسەکانتان حاڵی نابین!

ورده ورده نەفەرەکان خۆیان تێوه گلان، هەموو نەفەرەکانی نێو پاسەکه بونه دوو بەش... بەشێکیان لایەنگری بۆینباخییەکان بوون، بەشەکەی تریان پشتیوانی کاسبکاران بوون.

بۆینباخییەکان خۆیان له کاسبکاران زۆر به زیاتر ئەژمار دەکردو خۆیان لەوان به مرۆڤترو به شەخسیەتتر لەقەڵەم ئەدا.

پیرەمێردێك له لایەنگرانی کاسبکاران گوتی:

- لەم کارانه دەکەن بۆیه ژیان رۆژ بەرۆژ خراپترو گرانتر ئەبێ... تەواوی ئەم دەردەسەرییانه کێ دروستیان دەکات... مەگەر هەمووی لەژێر سەری ئێوەدا نییه... مەگەر هەموو بۆینباخییەکان هۆکاری گرفتەکان نین.

مەسەله خەریك بوو بنجی پەیدا دەکرد... له کێشەیەکی سادەی شاگرد شۆفێرێك و نەفەرێکەوه لەجێیەکی ترسناکدا کۆتایی پێ دەهات.

کابرای یەکەمجار ئەترسا کارەکه بەرەو خراپتر بچێ، پەنجەیەکی خسته سەر دەمی و نیشانەی مەترسی راگەیاند:

- وس...س...س...س

لەنێو بێ بۆینباخەکاندا نەفەرێکی مل ئەستوری تیا بوو پرسی:

- چییه...؟ چی بووه بۆچی (وس) ئەکەی؟. ئێوه ناتوانن کاڵەکێك له بڕکه بکەنەوه، بۆچی قسەی زیاده دەکەن!!

کابرای یەکەمجار دووباره بێدەنگ بوو، بەڵام کەسێکی تر لەناو ئوتوبووسەکه هاواری کرد:

- گەر قسەبکەم چی دەبێ؟
- گەر پیاوی لەپای قسەکانت دەوەستی!
- یانی تۆ نازانی... من کێم؟

کابرای مل ئەستور هاواری کرد:

- هەرکەس پێت خۆشە ببە. تۆ بۆ خۆت هەیت نەك بۆ کەسانی تر. هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو مشتێك کێشرا بەناو دەمیدا (پو... پورت..)

خوێن لە چاوەکانیدا مەوجی دەدا، جوێن لە دەمی ئەباری. ئەم جوێنانە وەك کلّپەی باروت وابوو هێشتا ئاشکرا نەبوو بوو کێ شەڕو هەرای دەست پێکرد، هەردوو دەستە بۆینباخدارەکان و کاسبکاران کەوتنە گیانی یەکتر، بوو بە تێرژان تەنها شاگرد شۆفێرو کابرای یەکەمجار بێ لایەن بوون و بەوانی دیکەیان دەگوت:

(ئاغایان تکاتان لێ دەکەم...)

(کاکە ناو پاس جێگەی شەڕ نییە).

بەڵام کەس گوێی بەم قسانە نەدەدا... خوا رەحمی کرد ناو پاسەکە پڕ بوو، کابرای مل ئەستور نەیئەتوانی زۆر پەلامار بدا... ئەو بێچارە لە ناوەڕاستدا بوو لەهەردوو لاوە کوتەکی ئەخوارد... هەرچۆن بوو شۆفێرەکە ئۆتۆمبیلەکەی لە ناوەڕاستی شەقامەکە راگرت...

شاگرد شۆفێرەکە پۆلیسی کە لە قەراغ شەقامەکە بوو بانگ کرد:

- سەرکار فریاکەوە... نەفەرەکان یەکتریان کوشت!

پۆلیس هات... نەفەرەکان کە هێشتا جنێویان بەیەک دەداو هەوڵیان دەدا بچنە خوارەوە.

" فەرمون بۆ بنکەی پۆلیس "

کابرای یەکەمجار بۆینباخەکەی ڕێکخستو کەوتە دوای کاری خۆی، ئوتوبووسەکەش ڕۆیشت باقی نەفەرەکان بەرەو بنکەی پۆلیس وەڕێ کەوتن.

بەڕێوەبەری پۆلیس لەبەر ماندوویی و بێ خەوی چاوەکانی سوور بووبوون، ماوەیەک گوێی گرت کاتێ لە مەسەلەکە گەیشت گوتی:

- بۆینباخی و کاسبکار مانای چی. لە یاسای ئێمەدا جیاوازییەک نییە لە بەینیاندا! ئەسڵی شەڕەکە لەسەر چی بوو! هەردوولا بۆ یەکیان روانی خۆشیان نەیاندەتوانی بزانن ئەسڵی شەڕەکە لەسەر چی بوو!..

یەکێ لە کاسبکارەکان گوتی:

- راستییەکەی گەورەم ئەوەیە بێ هۆ خۆمان لە کاری کەسانی تر هەڵقورتان.

خۆێنەری خۆشەویست راستی تا ئێستە ئەم مەسەلە بۆ تۆ پێش نەهاتووە؟! گەر بۆ خۆیشتان پێش نەهاتبێ. ئەوا ئاگاداری چەندین جارەی شتی وا بوویت.

" کارێك كه پەیوەندی به مرۆڤێکەوە نەبێت، بێخود خۆی تێهەڵنەقورتێنیٚ‌و دەردەسەر بۆ خۆی زیاد دەکات‌و گرفتی گەورە بۆ ژیانی دێنێتە پێش. "

## به من چی[٨]

خاڵە گیان هەمیشە ئامۆژگاری ئەکردین و ئەیگوت:

(تا دەتوانن هاریکاری خەڵکی بکەن...بەهۆی نەبوونی هاوکاریو یارمەتییەوەیە وڵات ئا بەم ڕۆژە ڕەشە گەیشتووە... لەبیرتان نەچێ وشەی (بە من چی؟) لە ژیانتان بسڕنەوەو بەردەوام لایەنگیری هەقیقەت بنو پێویستە یارمەتی هاووڵاتییەکانتان بدەن.

ئێمە جگە لە گوێڕایەڵیو (بەسەرچاو) گوتن چارەیەکی ترمان نەبوو، تا ڕۆژێك کارەساتێك رویدا!.

---

[٨] - لەرۆژنامەی شارەزوور بڵاو کراوەتەوە

خاڵەگیان تەمەنی گەیشتبووە شەستو حەوت ساڵ هەندێ لە دەردە پیرییەکان بەرۆکی پێ گرتبوو، ماوەیەك لە نەخۆشخانە خەواندیان.

لەم رۆژانەدا تازە لە نەخۆشخانە هاتبووە دەرەوە هێشتا بە یارمەتی داردەستەکەی بە ڕێگادا دەڕۆیشت لەسەر ئامۆژگاری پزیشکەکان چوو بۆ کەناری دەریا تا کەمێك هەوای پاکژ هەڵمژێتو تۆزێ پیادە ڕەویی بکات.

چون ئەو رۆژە هەینی بوو کەنار دەریا لەبەر زۆری خەڵك شەپۆلی ئەدا، ژنو پیاو سەرگەرمی مەلەکردنو خۆ بەخۆردان بوون.

هێشتا خاڵەگیان نەگەیشتبووە قەراغی دەریاکە دەنگی هاوارهاواری بەرگوێ کەوت:-

-فریامکەون... فریامکەون... خە...ریکە...ئەخ...نکێم.

کاتێ خاڵەگیان بە سەرسوڕمانەوە تەماشای خاوەن دەنگەکەی دەکرد، بینی منداڵێکی سیانزە چواردە ساڵ لەناو دەریاکە پەلەقاژەیەتیو خەریکە غەرق دەبێت.

دووری نێوان منداڵەکەو قەراغ دەریاکە لە پەنجا شەست پێ زیاتر نەدەبوو، بەڵام هیچ کەس گوێی پێ نەدەدا... خاڵەگیان لە بێ دەربەستی خەڵکەکە خەریك بوو شێت ئەبوو... بە خێرایی بۆ لای یەکێ لە بەلەم سوارەکان رایکرد:

- مەگەر نابینی ئەو منداڵە خەریکە ئەخنکێ خێرا سواری بەلەمەکەت بەو رزگاری بکە.

بەلەمەوان بە خوێنساردییەوە وەڵامی داوە:
- بە من چی؟ لەوانەیە خۆی حەز بکات بخنکێ.
خاڵەگیان بۆ لای یەکێکی کە رایکردو بە پاڕانەوەوە گوتی:
- ئاغا گیان فریای بکەوە... بەهەمان ئاواز خەریکە غەرق دەبێ.
بەلەمەوان پێکەنینێکی تایبەتی بۆ کرد:
- برا گیان بڕۆ بەلای کارتەوە... بە من چی کەسێ خەریکە دەخنکێ.
خاڵەگیان رایکرد بۆ لای گەنجێك وادەرئەکەوت مەلەوانێکی بلیمەتە:
- برادەر بۆ خاتری خوداو پێغەمبەر ئەو منداڵە رزگار بکە.
لاوەکە پێکەنی:
- بە من چی مامەگیان!
خاڵە دەستی کردە هاوارو فیغان:
- ئەی موسڵمانینە فریای کەون...
کەسانێ کە لەسەر زەوی راکشابوون و کەسانێك لەنێو چادرەکاندا سەرگەرمی یاری کاغەزو تاوڵە بوون. سەریان بەرزکردەوەو پرسیان:
- چی بووە؟
- ئەو منداڵە خەریکە غەرق دەبێ...

کاتێ لە مەسەلەکە گەیشتن دووبارە دەستیان کردەوە بە کاری خۆیان.. لەژێر لێوەوە بۆڵە بۆڵیان بوو:

- گەر زۆر دڵت بۆی ئەسوتێ خۆت بڕۆ رزگاری کە.

منداڵە خەریك بوو دوا چرکەساتەکانی تەمەنی ئەگوزەراند... هەرچەند چرکە جارێك زۆر بەئەستەم سەری لە ئاوەکە دەر ئەهێناو هاواری ئەکردو... دووبارە ئەکەوتەوە ژێر ئاوەکە.

خاڵەگیان بیست ساڵ ئەبوو نەچوو بووە ناو دەریاو دوای چەندین جار کەوتن لە نەخۆشخانە پزیشك مەلەکردن و چوونە ناو ئاوی لێ قەدەغە کردبوو... لە هەموویشی خراپتر ئەوە بوو خاڵەگیان مەلەشی نەدەزانی... لەوەبەر دەچووە نێو ئاوێك تا پشتوێنێ بهاتایەو کەمێ پەلەقاژەی دەکرد.

بەم حاڵەشەوە ویژدانی رێگەی نەدەدا منداڵێك لەبەر چاوی غەرق بێ... خێرا بڕیاری داو دەستی کردە داکەندنی جلەکانی.

ئەو خەڵکانەی لەوناوە بوون تەنانەت ئەوانەی ناو بارەکانیش کە سەرگەرمی خواردنەوە بوون، لە دەوری خاڵەگیان کۆبوونەوە.

خاڵەگیان بەبێ ئەوەی گوێ بە کەسانی دەورو بەرو گاڵتەجاڕییەکانیان بدات لەکاتێکدا جلەکانی دائەکەند لەبەر خۆیەوە ورتەورتی بوو:

- ئەم (بە من چی) یە نایەڵێت وڵات بەرەوپێش پێشڕەوی بکات... یارمەتی و هاوکاری خەڵکی کە یەکێ بوو لە سوننەتە پەسەنکراوەکانی ئێمە لەنێو چوو... لەم وڵاتەدا

کەس لە بیری کەسدا نییە... هەموو سوودی خۆیان دەوێ‌و وان لەبیر خۆیان‌و خێزانەکەیاندا.

لە گۆڕەپانەکەدا ئەو کەسانەی لەدەوری خاڵەگیان کۆبووبوونەوە ئەم قسانەیان گوێ لێ بوو:

(لەگەڵ ئەوەی کە پیریشە لاشەیەکی جوانی پێوەیە)

(ئاشکرایە لەگەنجیدا پاڵەوان بووە)

(ئەفسوس دەرپێ کورتەکەی باش نییە)

(تەماشای دەرپێ کورتەکەی کە ئەڵێی بیجامەی مەیمونە. ئاخر پیاوی باش خەجاڵەت نابی بەو دەرپێ کورتەوە لەبەردەم خانمان خۆت روت دەکەیتەوە.!!)

خاڵەگیان گوێی بەم جۆرە قسانە نەدەدا، رایکرد بۆ لای دەریاکەو خۆی فرێدایە ئاوەکەوە... بەڵام کە دوو سێ هەنگاو بەرەو پێش چوو پەشیمان بووەوە، ئاوەکە بە ئەندازەیەك سارد بوو کە دەست‌و پێی تەزاندو توانای جوڵەیان نەبوو، ئەو تۆزە مەلەش کە ئەیزانی لەبیری چووەوە!!

غەرق بوونی منداڵەکەی لەبیر چوەوە لە ترسی گیانی خۆی هاواری کردو داوای یارمەتی لە خەڵك کرد:

- خەڵکینە فریام کەون... خەریکە ئەخنکێم... یارمەتیم بەن.

بەڵام ئەو خەڵکانەی لە قەراغ دەریاکە وەستا بوون، هەروەك تەماشای فلیمێکی کۆمیدی بکەن، بە دەنگی بەرز پێئەکەنین و خاڵەگیانیان هەڵئەنا:

(بڕۆ بەرەو پێش... زۆرت نەماوە... زۆر جوان مەلە ئەکەی)

(بڕۆ... وا گەیشتیت)

(هەر زیندوو بی پاڵەوانی گەورە. کەمت ماوە بیگەیتێ).

خاڵەگیان هەر زوو زانی دادو بێداد بێسودەو هیچ کەس یارمەتی نادات... تەواوی هێزی خۆی کۆکردەوەو لەدڵەوە ناوی خودای هێناو داوای یارمەتی لەو کرد، ئومێدەوار بوو بتوانێ منداڵەکە رزگار بکات..

سەرئەنجام بوویە میهرەجانی پێکەنین، هەرچۆن بوو خۆی گەیاندە منداڵەکە، دەستی درێژکرد منداڵەکە رابکێشێت، منداڵەکە (خۆی خست بەپشتاو) سێ .چوار مەتر لێ دورکەوتەوە... خاڵەگیان بەبێ ئەوەی ئاگای لە فێڵی منداڵەکە بێ دووبارە بۆ لای ئەو چوو، دووبارە منداڵەکە خۆی لە خاڵەگیان دوورخستەوە... چون بڕیاری دابوو منداڵەکە رزگار بکات بەدوای کەوت، وەئاگا هاتەوە کە زۆر لە کەنار دەریاکە دوور کەوتۆتەوە بە ئەندازەیەك دوورکەوتبووەوە خەڵکانی قەراغ دەریاکە بە قەدەر بووکە شوشەیەك ئەکەوتنە بەرچاو.

منداڵەکە سەری لە ئاوەکە دەرهێناو جرتێکی بۆ خاڵەگیان لێدا!!
لە دواوە چەندجار چەمۆڵەی لێناو وەك با لە خاڵەگیان دوورکەوتەوە.
ئەوکاتە خاڵەگیان تێگەیشت چ هەڵەیەکی گەورەی کردووە چ کڵاوێکی گەورە کراوەتە سەری.
بەڵام چ سوودێکی هەیە پەشیمانی بێسودە، بە ئەندازەیەك ماندوو بووبوو نەیدەتوانی تەکان بدات فریشتەی مەرگی لە بەرامبەر خویٚ بینیو ساردی مەرگ تەواوی لەشی هێنایە لەرزە.
ئەمجارەش دەستی بەدادو بێدادو داوای یارمەتی کرد، بەڵام دەنگی نەدەگەیشتە کەس، تەنها دەستێکی ئەبینی بەتەکانو بەئاماژە ئەوی هان دەدا.
لەترسی گیان دەستی کردە هەوڵدانو بە هاوکاری خوای گەورە خۆی گەیاندە قەراغ دەریاکەو بێهۆش کەوت.
خەڵکە چەند بەرابەر بوونو هەرکەس شتێکی ئەوت:
(هەربژی پیرەمێرد... من وامدەزانی غەرق دەبیٚ..)
(نێرەکەر وەك ماسی مەلەی دەکرد... تەماشای پیرییەکەی مەکەن.)
(ئێمە دووسەعاتە لێرە وەستاوین تەماشای غەرق بوونی دەکەین)
پاش دوو سەعات خاڵەگیان هاتەوە هۆش خۆی سەیری کرد هەواڵێك لە جلەکانی نییە. دوایی تێگەیشت ئەو منداڵەو

هاوكارانی بەم فێڵە مرۆڤی سادە هەڵنەخەڵتێنن و گۆلی خۆیانی لێدەكەن و جلەكانی دەبەن.

بە زحمەت لە جێگەی خۆی هەستا... بە هەمان دەرپێی كورتەوە كە ئەتوت بیجامەیە بەرەو ماڵ بوویەوە! لەبەر لاوازی و نەخۆشی ئاوی دەریاكە گاریگەری تەواوی تێكردبوو سەراپای ئەلەرزی و ددانەكانی چۆقەیان ئەهات... كۆمەڵێك منداڵی بەرەڵا شوێن خاڵەگیان كەوتبوون (وەك بووكە بە بارانە بەڕێیان دەكرد) ئەبێ سوپاسی خوا بكەین كە ماڵەكەیان نزیك بوو توانی خێرا خۆی بگەیەنێتە ماڵەوەو لە دەست منداڵ و خەڵكە بێكارەكە رزگاری بێ. خاڵەگیان سێ مانگی تەواو لەسەر جێگە نەخۆشی لێیكەوت.

رۆژێك كە هاتەوە سەر خۆی و لەدەست فریشتەی مەرگ رزگاری بوو بە هاوكاری گۆچانەكەی لەماڵ وەدەر كەوت و تۆبەی كرد كە ئیتر لە ئێستە بە دواوە هاوكاری كەس نەكات:

(هەركەس ئەیەوێ بمرێ... با بمرێ...هەركەس ئەیەوێ بخنكێ...با ببێ... بەمن چی خۆم تووشی دەردەسەركەم).

## شارەوانی هەڵبژێراو

دوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شار، کاتێ کۆبوونەوەی ئەنجومەن سەبارەت بە هەڵبژاردنی (شارەوانی) تازە بەسترابوو لەناو یەکێ لە ژوورەکانی شارەوانیدا کارمەندو عەریزەنووس و هەتا دوودانە فەڕاشیش لە دەوری یەك کۆبوونەوەو دەربارەی شارەوانییە تازەکە کە جگە لە ڕەزابەگ کەسێکی تر نەبوو باس و خواسیان دەکرد... (ئاخ.. ئەگەر بزانی چەند خۆشحاڵ بووم)...بەخوا لەخۆشیدا خەریك بوو بفڕم؟.. (بۆچی ئەگونجێ مرۆڤ خۆشحاڵ نەبێ.. من لە خۆشیدا گریام..)

((ئاگات لەمن نییە.. ئەگەر لەبەر خاتری فەرمانگە نەبووایە سەمایەکی جوانم دەکرد..))

[1] لەرۆژنامەی شارەزور بلاوکراوەتەوە

((کاتێ بیستم ڕەزابەگ هەڵبژێردراوە حەزمکرد چەقەنە لێبدەم..))

((کوڕەکان لێتان ناشارمەوە... بۆئەوەی ڕەزابەگ هەڵبژێرێت من خەتمێکی قورئانم کردبوو))

((بە گیانی ئێوە من دەستەیەك مۆمم نەزری (پیر) کردبوو!...))

((ئەم قسانە بۆ وتن باش نییە بە مەرگی منداڵەکانم من (۳۰۰) تا (٤٠٠) لیرەم خەرجی ئەمکارە کردووە!))

((باشە. شایەنییەتی مرۆڤێکی زۆرباشە!...)) ((هەرباش و بەس... باوکی فەقیرو هەژارانە (شەوو ڕۆژ بۆ ئەم میللەتە زەحمەت ئەکێشێ!..))

((چ مرۆڤێکی بەدینە!.. نوێژی نافەوتێ!...))

((کاکەگیان هەرچییەك بێ نەجیب زادەیەو لەسەر سفرەی باوکی بووە))

((کەس بەقەدەر من نایناسێت...من لەگەڵ خزمەکانی ئەو لە کۆنەوە ئاشناین...))

((چی.!.. ئاشنای چی... من هەر خزمەمە!. کچی خاڵی شارەوانی تازە، ژنی کوڕە خاڵی دایکی منە!!...))

((بابەگیان... من ماوەیەك لە ماڵی ئەوان کارم کردووە!.)) مرۆڤی واپاك و ڕاستم لە تەمەندا نەدیوە!..

(((مرۆڤێکی زۆر خۆبەکەمزانە.))

((لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەدەب و میهرەبانە!..))

((بەراستی هەڵکەوتوو... هۆشیار...کارکەر... زیرەك!.))

((یانی شارەوانیکی هەڵکەوتووە...))
تایپینستێکی جوان تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو گوێی لە قسەکانی ئەوان گرتبوو بە پێکەنینەوە وتی:
- رۆژێك لەناو پاسدا بە ئەندازەیەك منی خەجاڵەت کرد، باس ناکرێت... لە جێگەی خۆی هەستاو بە زۆر منی لە جێگەی خۆی دانیشاند...
تایپێستی دووەم کە کاتی خانەنشین کردنی هاتبوو برۆکانی هەڵتەکاند، وتی:
ئەوە مەرج نییە!. پیاوان هەر کاتێ ژنێك ببینن ئاو بەدەمیاندا دێتە خوارەوە..
_ نا.. ئەو ڕوانینی خراپ نەبوو.
- چیت پێبڵێم... لەوانەیە تۆ تێنەگەیشتبێت!. تایپینستە جوانەکە لەو بووختانە وەکو لێواری تەنوور سوور هەڵگەڕا بە شێوەیەکی تایبەت وەڵامی دایەوە:
- بڕوانە... من نەك بەو بە هیچ کەس ڕوونادەم...
سەرۆکی بەشەکە بۆ ئەوەی کار بەرەو جێگەیەکی باریك نەچێ خێرا هاتە نێوەندەکەوەو گوتی:
- ئاغای شارەوان پیاوێکی بەشەرەفەو چاوی لەسەر شەرەفی کەس نییە.
سەرۆکی حسابداری قسەکانی سەلماند:

- راسته... چەند ساڵە من لەگەڵی کاردەکەم تا ئێستا نەمدیوە تەماشای یەکێ لە خانمە تایپێستەکان بکات..

یەکێ لە فزولباشییەکانی کۆڕەکە گوتی:

- نەکا (خواجە- خەساو بێت)

- ئەوە چ قسەیەکە دەیکەیت؟؟. چوار پێنج منداڵی هەیە... ئەوە لە روی ئاین و شەرافەتییەوەیە!

- بەڵێ بابەگیان، بەردەوام نوێژی لەیاد ناچێت.

- هەر زیندوو بێ (شارەوانی) تازە!.

فەرمانبەری تازەهاتووش حەزی دەکرد شتێ بڵێ:

_ لە تەواوی ئەم ماوەیەدا رۆژێك نەبووە تەنانەت پێنج دەقیقە لە فەرمانگە دوابکەوێت هەمیشە پێش وەخت لە پشتی مێزەکەیەوە دانیشتووە.

هەموو بە جارێ پەسەندیان کرد.

((بەڵێ نرخی کات زۆر دەگرێ))

((لەگەڵ سەرۆکەکانی تر زۆر جیاوازە!..))

((من زیاتر حەزم لە جگەرەکێشانەکەیەتی... هیچ یەك لە هونەرمەندەکان ناتوانن وەك ئەو جگەرە بکێشن))

((بەراست، بەراست جگەرە کێشانەکەیشی زۆر جوانە))

((بابە ئەسڵزادەیە... گاڵتە نییە... لە خێزانە گەورەکانە))

((باوکی لە باوەڕپێکراوانی گەورەکانی وڵاتە))

((بەرگوێم کەوتووە باپیری سەدری گەورە بووە)) (منیش بەرگوێم کەوتووە)
((یەکێ لە باپیرانی لە جەنگەکانی ئێران و عوسمانی ناوچەی زۆری ڕزگارکردووە!.))
((جێگەی سەرسوڕمانە... بەراستی شایەنی ستایش کردنە!. خەڵکی ئەمشارە چ بەختێکیان هەیە!.))
((دوای چی؟.وابیر ئەکەنەوە مرۆڤێکی کەمە!.))
((نەبابە..کێ قسەی وایکردووە...)) ((بەخودا بەخت لەوە زیاتر نییە کە (شارەوانی) مرۆڤێکی ئاوایە!.))
((لە ئێستە بەدواوە ئەبینی کارەکان چۆن بە باشی بەڕێوە ئەچن...))
لەهەمان کاتدا فەڕاشێك کە لەناو هۆڵەکەدا هاتووچۆی دەکرد بۆ ئەندامانی ئەنجومەن.چاو قاوەی دەبرد، بە شپرزەییەکی زۆرەوە وەك کەسێك لەبەرەی جەنگدا هەواڵ بۆ ئەوانەی دواوە ببات هاتە ناو ژورەکەوە بە شێوەی پچڕ..پچڕو لێوە لەرزێ وتی:
دەنگەکان بەهەڵە بڵاوکراونەتەوە... (حیلمەت بەگ) بووە سەرۆکی شارەوانی.. ئەم هەواڵە وەکو بۆمبێك لە ناو بینای شارەوانیدا تەقییەوە... فەرمانبەرەکان بە بێئاگا لە ژوورەکە هاتنە دەرەوە. کۆبوونەوەیەك بەو گەرمی و گوڕییە، سەبارەت بە چاکەو پیاوەتی (ڕەزابەگ) بەستبوویان وەك بەفری بەرهەتاو توایەوەو کۆتایی پێهات...

هێشتا چەند خولەکێك تێنەپەڕیبوو کارمەندەکان دووبارە لە ژوورێکی کە کۆبوونەوە:
((زۆری نەمابوو (کابرا) ببێ بەبار بەسەرمانەوە!..))
((خودا ڕەحمی بە ئێمە کرد!..))
((نازانی چەند خۆشحاڵم... بە وتن باسناکرێ!..))
((بۆچی ئەکرێ مرۆڤ خۆشحاڵ نەبێ..))
((ئاگاتان لەمن نییە... ئەگەر لەناو فەرمانگە نەدەبوو سەمایەکی جوانم دەکرد!..))
((کاتێ بەرگوێم کەوت دەنگەکان هەڵە بووە ویستم چەقەنە لێبدەم))
((بەڕاست ئەگەر (ڕەزابەگ) ببووایە بەسەرۆکی شارەوانی حاڵمان بە کوێ دەگەیشت؟))
((هیچ!. قوڕ ئەکرا بەسەرماناو بەدبەخت ئەبووین!..))
((پێویستە خێرێکی گەورە بکەین کە ئەو بەڵایەمان لە کۆڵبووەوە!!))
((کوڕەکان شاردنەوەی ناوێ.. بۆئەوەی (ڕەزابەگ) هەڵنەبژێرێت مەولودییەکی گەورەم کردووە!.))
((نازانی چەندە هەوڵمدا تاکو لایەنگرانی (ڕەزابەگ) پاشگەز بکەمەوە!.))

((ئەگەر (ڕەزابەگ) ببووایەتە (شارەوانی).. بەخوا... بە پێغەمبەر.. بە ئەولیا قەسەم، دەقیقەیەك لەم شارەدا دانەئەنیشتم بە زۆری لە شارەوانی وازم دەهێنا...))

خانمی تایپیێست بەهەمان نازو عیشوەو خۆبادانەوە قسەکانی ڕاستان:

_ کێ دەمایەوە؟

تایپیستە بەتەمەنەکە بۆ ئەوەی لە هاوکارانی دوانەکەوێ وتی:

_ دەرگای شارەوانی ئەبەسترا!.

بەڕێوەبەری دەفتەر جگەرەیەکی داگیرساندو دەستی کرد بەنەفەس لێدانی..

_ خوای گەورە ڕەحمی بە ئێمە کرد!.. نازانی ((چەند هیچ نەدیوو برسییە))!... من لە هەوەڵ ڕۆژەوە تێگەیشتم تازە پیاکەوتووە!..

سەرۆکی بەڕێوەبردنی کارەکانیش لە هاوڕێکانی. کەمتر نەبوو بۆی زیاد کرد:

_ هیچ کەس لە من باشتر نایناسێت!.. چونکە هاودەورەم بوو، بەڵام یەك زەرە لێوەشاوەیی بۆ ئەو کارە نییە!..

((زۆر بەدکردارە))

خانمی تایپیێست پێداگری کرد:

_ ئەگەر هەموو پیاوانی دونیا لەناو بچێ تەنها ئەو لەسەر زەوی بمێنێ. بێشەرەفم ئەگەر تەماشای بکەم.

تایپێستە بەتەمەنەکە نەیدەویست لە هاوکارانی دوابکەوێ:

_ ئاخر كێ تەماشای ئەو چرچاوە دەكات.
ئەوەندەی من بزانم بە ئەندازەیەك بێ ئابڕووە تەنانەت چاو لەسەر فەڕاشەكانیش هەڵناگرێ!
تەنانەت شەوانی مانگی رەمەزانیش مەستو سەرخۆشە.
خوا ئەم جۆرە مرۆڤانە رسوا بكات!
تەماشا (مژلێدانی جگەرەكەی) بە جۆرێك جگەرە دەكێشی مرۆڤ لە تەماشاكردنی بێزی دێتەوە.
بەراستی مرۆڤێكی هەرچیو پەرچییەو... تەنانەت ناشتوانێ خۆی بەڕێوە ببات.
ئەوەندەی من بیناسم رێك لە باوكی ناڕەسەنی ئەچێت.. ئەویش بەردەوام سەرخۆش بوو.
ئەڵێن باپیریشی هەر خەریكی راوو روت بووە.
نازانێ روگەی موسڵمانان لە كوێوەیە.
كورە روگەی چی ئەو شەوو رۆژ مەستو سەرخۆشە، گەر لێی بپرسی ناوی هەموو بارەكانی ئەم شارەت بۆ هەڵئەدا.

**************

خوێنەری ئازیز لێرەوە كۆتایی پێهێنانی جێ دێڵم بۆ تۆ تا بزانێ ئەوانەی بەردەوام خەریكی ماستاوچێتیو پیاهەڵدانن هەڵویستو رەفتاریان چۆنەو هەمیشە لەكام لاوە بایهات ئەوان شەنی خۆیان دەكەن.

## بێدەنگ بە... فزولی مەکە[1]

لەهەمان مانگی یەکەمی لەدایك بوونەوە هەر کە دەم دەکاتەوە بگری دایکی خێرا مەمکە ئەتەپێنێتە دەمی و ئەڵێ:
لالالا... پش پش پش پش مەگرییە! بێدەنگ بە ئێستە پشەکە دێت ئەتخوات!!!! شەوان کە دەنگی گریانی بەرز ئەبێتەوە باوکی ئەڵا:
"ئەو منداڵە بێدەنگ بکە مێشکم چوو!"
کاتێ تۆزێ گەورە ئەبێ باوك و دایکی پێکەوە بەردەوام پێیدەڵێن:
" هاوارمەکە!.. بێدەنگ بە!..ئارامبە!.."
گەر ماڵەکەیان میوانی لێبێت ئەوا ئیتر ئەبێ وەکو پەیکەر لەپاڵ دیوارێك دابنیشێ و دەنگی دەر نەیەت!! ئەگەر میوانیشیان

---
[1] لەرۆژنامەی شارەزوور بلاوکراوەتەوە

نەبێت هەمدیسان هەر دەبێ بێدەنگ بێ‌و ئارام‌و بەئەدەب دابنیشێ هەتاوەکو دایکی بە باشی بە کارەکاندا را بگات!
ئەم حاڵە تا تەمەنی حەوت ساڵی بەردەوامە!
کاتێ ئەچێتە قوتابخانەیش هەر کە بیەوێ دەمی بکاتەوە قسەیەك بکات خێرا ئاغای مامۆستا هاواری لێدەکات:
بێدەنگ! ورتەو نەیەت: هەڵەوەڕی قەرەچەناغ
زۆرشت هەیە کە نایزانێ‌و حەز دەکات لە مامۆستاکەی بپرسێ، بەڵام ئاغای مامۆستا وەڵامی ئەداتەوە:
ئەو فزولیانەیان بە تۆ نەداوە وانەکانت بخوێنە!
تا تەمەنی ئەگاتە دوازدە ساڵی کاتێ ئەچێتە قوناغی ناوەندی هەر کە دەمی کردەوە قسە بکات پێیدەڵێن "هیچ کەس پرسیاری لە تۆ نەکردووە بێدەنگ بە"
بەڕێوەبەری قوتابخانە هەموو رۆژێ بەسەر پۆلەکاندا دوبارەی ئەکاتەوە.
((قسە، کردنی زیوەو، نەکردنی زێڕە!))
مامۆستای رەوشت ئەڵێت:
((بۆیە دوو گوێچکەیان پێداوی‌و یەك زمان
هەتاوەکو دوو قسە ببیستی‌و یەك قسە بکەیت))
هەموو سەعاتێ ئەم قسانە بەرگوێ دەکەون:
بێدەنگ!
بێ قسە!

هەڵەوەڕی مەکەن!
هەناسەتان دەرنەیەت!
لە قۆناغی دواناوەندی وشەکان بە ڕستە جوانو توانج ئامێزەوە ئەگوترێن:
((زمان گرتن خۆی جۆرە هونەرێکە))
((زمان سەری خاوەنی ئەدا بەباد))
((تا پیاو قسە نەکات...
عەیبو هونەری دەرناکەوێت))
((قسە وەك گەنج وایە کلیلی بەدەست خاوەنییەتی))
تا تەمەنی نۆزدە ساڵی بەمجۆرە بەردەوام دەبێ.
چووە زانکۆوە، بەڵام هەمدیسان هەم لە ماڵو هەم لە زانکۆ بەردەوامە...هەر کە بیەوێت بیروباوەڕی خۆی بدرکێنێ دایکی ئەڵێ:
کاتێ گەورەکان قسە ئەکەن پێویستە بچوکەکان گوێ بگرن!
جارێك گەر لە وانەیەکدا رەخنەی هەبێو لە مامۆستاکەی پرسیار بکات مامۆستاکەی ناڕەحەت ئەبێو ئەڵێ:
- ئاگات لەدەمت بێ!
سەرەنجام زانکۆیشی بەمجۆرە تەواوکرد... چووە ناو فەرمانگەوە ئەوانی تر لە بۆڵە بۆڵی ئەم ناڕەحەت ئەبنو هەر کە بیەوێ رەخنەیەك بگرێ هاوکارانی پەنجە ئەخەنە سەر دەمیان:
"س، بێدەنگ

بەدبەختییەك بەسەر خۆت دێنیت"

سەرۆك ئەیگوت:

شتێ كە پەیوەندی بە تۆوە نییە خۆتی تێهەڵمەقورتێنە!!

لەناو فەرمانگەش بەم جۆرە كار بەڕێوەچوو!..

كاتێ زەماوەندی كرد ژنەكەی ئەیگوت:

تكات لێدەكەم خۆت هەڵمەقورتێنە!

ئەم شتانە پەیوەندییان بە پیاوەوە نییە!

كە منداڵی بوو... منداڵەكان ژنیان هێناو شوویان كرد.. بەڵام ئەو ناچار بوو هەر بێدەنگ بێ!!

منداڵەكان ئەیانگوت:

- بابە كە تۆ لەم شتانە تێناگەیت باشترە لە گۆشەیەك دانیشیو بێدەنگ گوێ بگریت!.

******

خوێنەری خۆشەویست!

تۆ وادەزانی بوونی ئەو پیاوە ئەفسانەیە...نەخێر. ئەم لە رووییەكەوە منم... لەروویەكەوە تۆیت!.. لەروویەكەوە هەمومانین!.

لەكۆندا ئەیانگوت ((ژنان دەرمان ئەكەنە ناو چێشتو تا دەمی پیاوانی پێ ببەستن، تۆش وا گومان دەبەیت كە ئەو دەرمانەشیان بە تۆ دابێ؟

## زەگی یەکەم سەرووی شار... زەنگی دووەم خوارووی شار"

قیژەی ئیستۆپ لە تەکسییەکە هەستا، دەنگی خشانی تایەکانی بەسەر قیرەکەدا بەرزبوویەوەو لە قەراخی جادەکە وەستا... بێچارە شۆفێری تەکسییەکە گێژ بووبوو، تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد..

خەڵکەکە هەرچەند هەمووشیان ئەیانزانی، بەڵام هەر ئەیانگوت:

- تەکسییەکە لەگەڵ ئەو ماتۆڕە دەعمی کردووە!

ماتۆڕێك کەوتبووە قەراغ شۆستەکە لەپەنایدا زەلامێك بەجلوبەرگێکی جوانەوە کەوتبوو.

لەناو خەڵکەکەدا کەسێك هاواری کرد:

- بۆ وەستاون! خێرا ئەو بێچارە بگەیەننە نەخۆشخانە.

لەم کاتەدا پۆلیسی رێگاوبان گەیشت لێدانی دڵی ماتۆڕسواری تاقیکردەوە، خۆشبەختانە هێشتا دڵی لێدەدا، پۆلیسەکە بە

" لەرۆژنامەی شارەزوور بلاوکراوەتەوە

هاوکاری دوو سێ نەفەر ژێر باڵی ماتۆڕسواریان گرتو لە زەوی بەرزیان کردەوە لەم کاتەدا ماتۆڕسوار وەئاگا هاتەوە، بە زەحمەت لە جێگەی بەرزبوویەوە لەسەر زەوی دانیشتو بە پۆلیسەکەی گوت:

ئەتوانی ئەو کابرایەی داویەتی لە من بانگی بکەیت؟

شۆفێرەکە کە لە ترسا رەنگی پەڕیبوو، وەك بی ئەلەرزی بە هەمان دەنگی لاواز گوتی:

- فەرموو کاکە گیان لێرەم.

ئەوکە بەوپەڕی فەلاکەتو نارەحەتی چوو بۆ لای و گوتی:

- برادەر دەستت بدە با ماچی بکەم! زۆر سوپاست دەکەم! لەناو خەڵکەکەدا دوو کەس دەستیان کرد بە فزولی:

- بێچارە شێت بووە

- عەقڵی لەدەستدا

پۆلیسەکە ماتۆڕسواری زامداری سوار تەکسییەکە کردو بە شۆفێرەکەی گوت:

- زوو ئەم کابرایە بگەیەنەرە نەخۆشخانەو خۆت بگەڕێرەوە ئێرە. تەکسییەکە بەخێراییەکی زۆر کەوتە رێ، کابرای زامدار هێشتا سوپاسی لە شۆفێری تەکسییەکە ئەکرد:

- نازانم بەچ زمانێك سوپاست بکەم!

شۆفێرەکە زەردەخەنەیەکی تاڵی بۆ کردو وەڵامی داوە:

- نیگەران مەبە ماوەیەك لەمەوبەر دایكی منیش كەوتە ژێر ئۆتۆمبێل وەك تۆ هۆشی لەدەست دابوو! بەڵام دوای هەفتەیەك هاتەوە سەرخۆی بەخوا ئاغا گیان ئەم كارەم بە ئەنقەست نەبوو،
كابرا نارەحەت بوو گوتی:
- قسەی سەیر ئەكەیت؟ ئەگەر جارێكی تر قسەی وا بكەیت ئەوا لێت خۆش نابم! من بەراستی لێت مەمنونم! هەرگیز ئەم چاكەیەت لەبیر ناكەم!
شۆفێرەكە دڵنیا بوو كابرا زیان بە ئەقڵی گەیشتووە گوتی:
- برای خۆشەویست بەخوا كەمێ دان بەخۆتا بگریت..
- هەمدیسان لەم جۆرە قسانە دەكەیت... وەڵڵا بیلا من تا تەمەنم مابێ خۆم بە قەرزاری تۆ ئەزانم!
كابرا قسەكانی هێند بە دڵنیاییەوە ئەكرد، شۆفێرەكە كەوتە گومانەوە لەوانەیە كارێكی باشی ئەنجام دابێ، تۆزێ توندی بە قسەكانی داو گوتی:
- چی دەڵێی برا وەزیفەمانە خزمەتی هاووڵاتیانی خۆمان بكەین!
- نە كاكە بەو جۆرە نییە.
- كاتێ تۆ رازی بی بچیتە ژێر ئۆتۆمبێلەكە بێشەرەفم ئەگەر لەتۆیەتت نەكەم!!
- زۆر سوپاست دەكەم!
- شایەنی نییە، من كە پێم گوتی ئەمە وەزیفەمانە كە خزمەتی هاووڵاتیان بكەین!

گەیشتنە نەخۆشخانە، شۆفێرەکە زامدارەکەی بردە ژووری پزیشک‌و بەهێواشی بە پەرستارێك کە لەویا وەستا بوو گوتی:
- دادەگیان ئەم کەسە ئۆتۆمبێل لێیداوە! شۆفێرەکە دوای ئەوە کابرای لێدراوی جێ هێشت‌و بە خێرایی گەڕایەوە شوێنی دەعمەکە.
پزیشکێکی لاوی یەخە هەڵدڕاوی بردە ناو ژوورەکەو لێی پرسی:
- چی بووە؟
لاوی یەخە هەڵدڕاو لەگەڵ ئەوەی ئاشکرابوو ئازارێکی زۆری ئەکێشا زۆر لەسەرخۆ وەڵامی داوە:
- خۆشبەختانە ئەڵێی ئێسقانی لاقم شکاوە!
پزیشکەکە لە قسەکردنی نەخۆشەکە هۆپێکی کردو گوتی:
- فەرموت خۆشبەختانە!
- بەڵێ دوکتۆر گیان لەم پێشهاتە زۆر خۆشحاڵم!
پزیشکەکە بڕوای نەدەکرد ئێسقانی لاقی شکابێ‌و پێی خۆشحاڵ بێ! پانتۆڵەکەی داکەندو تەماشای کرد، تەماشای کرد راست دەکات لە دوو شوێن ئێسقانی قاچی شکاوە!
نەخۆشەکە پرسی:
- ئاغای دوکتۆر ئەبێ چەندە لەسەر جێ بکەوم؟
- نازانم... سێ چوار مانگ! لەوانەیە زیاتریش!
کابرای یەخە هەڵدڕاو زەردەخەنەیەکی رازی بوونی کردو گوتی:
- خوا باوکی شۆفێرەکە عەفوو کات!

پزیشکەکە زیاتر سەری سوڕماو پرسی:

- چۆن ئەو رۆژگاری تۆی بەمحاڵە گەیاندووەو هێشتا دۆعای بۆ دەکەی؟

بەڵی ئاغای دوکتۆر!

مانای چی؟.لەوانەیە قاچت سەقەت بێ ئەوکاتەش دوعای خێری بۆ دەکەیت؟

مۆڵەت بدە پێش ئەوەی بێهۆشم کەن هۆکارەکەیت پێ بڵێم..

پزیشك لەم هەموو ئازاییو تاملّ کردنی نەخۆشە خەریك بوو شاخی دەر دەکرد، بەڵام بەسەر خۆیدا زالّ بوو وەڵامی داوە:

- پێش هەموو شتێ ئەبێ قاچت تیمار بکرێ.

سوپاست دەکەم من ئەوندە زەجرەم کێشاوە کە ئەم دەردو ناڕەحتییە لەچاویا هیچ نییە!

نەخۆشەکە تەنانەت ئەو پێشنیارەی پزیشکی رەتکردەوە..کە وتی:

- لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵکەوە، هەرچۆن لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو بەوجۆرە دەستی کرد بە گێڕانەوەی داستانەکەی:

ئاغای دوکتۆر من لیسانسمو بەشی ئەدەبیاتم تەواو کردووە ئێستە دەرس بە دووەمی ناوەندی دەڵێمەوە.

- عەجیبە یانی تۆ دەبیری[12]؟

---

[12] دەبیر: مامۆستای دواناوەندی

"بەڵێ ئاغای دوکتۆر... سێ ساڵ لەمەوبەر لەو قوتابخانەی من دەرسی تیا ئەڵێمەوە تەنها سێ (دەبیر) هەبوون لە رشتەی ئەدەبیات، ساڵی پار بووینە پێنج، ئەمساڵ بووینەتە شەش، هەموو ئەوانەی کە زیادیان کردووە لە خزمانی دەستەڵاتدارانن، بێچارە بەڕێوەبەر هەرچی هاواری کردو گوتی:
" من ئەم هەموو مامۆستایە چی لێبکەم" هیچ کەس گوێی بە قسەکانی نەدا!
وەزیری پەروەدە گوتی:
- ئەمانە هەموویان مەسئولی مل ئەستور لە پشتیانەوەیە، ناتوانم بۆ شارە دوورەکانیان بنێرم!
هەرچەند مامۆستا زیادی بکردایە، سەعاتی وانەی مامۆستا کۆنەکان کەمی ئەکرد، لە یاسای خوێندگا ناوەندییەکاندا هەر مامۆستایەك هەفتەی لە هەژدە سەعات دەرسی کەمتر بێ لە مووچەکەی کەمدەکەنەوە! چون من لە هەموویان بێپشتتر بووم، هەر مامۆستایەکی تازە ئەهات چەند سەعات لە وانەکانی من کەمدەکرایەوە، لە ٢٥ سەعاتی هەفتانەوە بوو بە ١٥ سەعات!!
رۆژێك بەڕێوەبەر بانگی کردم بۆ ژوورەکەی خۆی‌و گوتی:
- تۆ زۆر مرۆڤێکی پاکی‌و زۆر بە چاکی بە کارەکەت رادەگەی.
منیش سوپاسم کرد، بەڵام ئاشکرابوو بەڕێوەبەر ئەیویست شتێك بڵێ، بەڵام دوودڵ بوو لە وتنی پاش مدەتێك بەردەوام بوو وتی:
بەڵام ناتوانم لە ٥ سەعات زیاتر وانە وتنەوە بە تۆ بدەم!!

گوتم:

- جەنابی بەڕێوەبەر من واز لە زیادەی خۆم دێنم بەڵام گەر لە ١٨ سەعات کەمتر وانە بڵێمەوە ئەوا مووچەکەم نادەنێ!

من بڵێم چی خۆت بیرێکی بۆ بدۆزەرەوە.

پازدە سەعات بوو بە پێنج سەعات، بینیم گەر کارێك نەکەم مووچەکەم لەدەست دەدەم! دەستم کرد بە پەیوەندی کردن بەم بەڕێوەبەرو ئەو بەڕێوەبەر، نازانم پەیوەندیم بە چەند بەڕێوەبەرەوە کرد، بۆ ئەوەی چەند سەعاتێك وانە وتنەوەم پێ بدەن.

بێچارە بەڕێوەبەرەکان هیچیان نەیانتوانی لەبەر من بەرنامەکانیان بگۆڕن! بەڵام لە ڕوی هاوکاریو یارمەتیدانەوە ڕازی بوون کارێکم بۆ بکەن، هەرکامیان یەکی دوو سەعات لە دەرسەکانی کۆتایم پێبدەن.

سەرئەنجام بەهەر فەلاکەتێك بوو ١٨ سەعاتەکەم پڕکردەوە، بەڵام وەکو گۆشتی قوربانی چۆن هەر بەشێکی ئەدەن بە ماڵێك، منیش هەر سەعاتێك لە قوتابخانەیەك وانەم ئەوتەوە.

بۆ ئەوەی بە کارەکەما بگەم ماتۆڕێکم کڕی، هێشتاش فریا نەدەکەوتم، چونکە شوێنەکانیان زۆر لەیەکەوە دوور بوو، بۆ نموونە: ئەمڕۆ کە چوارشەممەیە حسابی بکە لە کاتژمێر یەك لە باکوری شارو لەکاتژمێر دوو لەباشوری شارو کاتژمێر سێ لە ناوەندی شار، لە نێوان هەر کاتژمێرێکدا تەنها ١٠ خولەك مۆڵەت

هەیە، چۆن ئەتوانم لەناو ئەم شەقامە قەرەباڵغانەی شاردا لە سەرووی شار خۆم بگەیەنمە خوارووی شار.
بۆ ئەوەی بەکارەکەمدا بگەم ناچار بە خێراییەکی وا لێبخوڕم تەنانەت ئامبووڵانسیش بە تۆزی پێما نەگات.!
جا براکەم خۆت حسابی لەبەر خاتری پاروەنانێك ڕۆژانە چەند لەژێر فشاری دەرونیدام، بە خۆمم گوت:
" بچمە لای پزیشکێك بەڵکو لانی کەم مۆڵەتی هەفتەیەکم پێبدات بەڵکو تۆزی ماندوییم بحەوێتەوە!
بەڵام دوکتۆرەکان ئا بەو جۆرە وەڵامیان دامەوە:
وادەزانی هەر تۆ بەمجۆرەی منیش لە نەخۆشخانەیەکی میری و دوو نەخۆشخانەی ئەهلی کار ئەکەم، عەسرانیشم عیادەی خۆم هەیەو ڕۆژانەش لە ماڵەوە لانی کەم سێ چوار نەخۆش سەردانم ئەکەن.
چەندێك هەوڵمدا جیاوازی کاری خۆم و ئەوانیان پێبڵێم، بەڵام ئەوان نەیان بیست.
ناچار بووم بەردەوامی بە کارەکەم بدەم و لە بەیانی تا ئێوارە وەك چەرخوفەلەك بێم و بچم، لەبەر خاتری پارویەك نان ڕۆژانە سەد کیلۆمەتر بە ماتۆڕ بڕەم.!
ئەوا دوو ساڵی تەواو بەم سەگ مەرگییە ئەیگوزەرێنم، گەر ئەم دەعمە نەبووایە یان شێت ئەبووم یا خۆمم ئەکوشت. هەر لەبەر ئەمەش نەك شکایەتم لە شۆفێرەکە نییە بەڵکو زۆر سوپاسیشی

ئەکەمو لە خواش داواکارم تا یەکسالی تر لەسەر ئەم قەرەوێلەیە هەڵنەستم!

دوای، وتنی ئەم قسەیە، بێهۆش کەوت تا شتومەکی نەشتەرگەری ئامادەبوو، وڕێنەی دەکردو ئەیگوت:

" کاتژمێری یەکەم سەرووی شار، زەنگی دووەم خوارووی شار، زەنگی سێیەم ناوەندی شار. "

### به گشتیی دوو خولەك كات نەگری...؟؟؟[12]

ماوەیەك بوو بەردەوام ژنەكەم مێشكی سەری بردبووم، تا هەرچۆن بووە ماڵێكی بچوك بكڕم! تا ئەوەندە لە ماڵی خەڵكدا نەبین و نەبیستین كە لەملاولا خاوەن خانوو باسمان بكا، ئێمەش ناچار بین قبووڵی بكەین.

ئەم قسانە ئەوەندە دووبارە كرانەوە ناچار بووم بە قسەی ژنەكەم بكەم و هەرچۆن بێ بە نیوە قیست و نیوە نەخد خانوویەكی بچوك بكڕم.

دایكی مستەفا لە شەش مانگی یەكەمدا زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام لەمەودوا وردە وردە كەموكوڕییەكانی دی سەریان هەڵدا، ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر ئەوی نیگەران كردبوو نەبوونی تەلەفۆن بوو.

[12] ئەگوڤاری شارەزوور بڵاوكراوەتەوە

من بەرگەی هەر نەبوونی نائارامییەك دەگرم، بەلام بەرگەی قرتەو بۆڵەی دایکی منداڵانم ناگرم. کەوتمە خۆ هەرچۆن بووە تەلەفۆنێك پەیدا بکەم، تا ئەم مەسەلە کە بووەتە گرێی دەرونی بۆ خێزانەکەم لە ناوی ببەم.
بەم بۆنەیەوە لەگەڵ" ئەحمەدئاغا" دەڵالی کڕین‌و فرۆشتنی تەلەفۆن کە بە قسەی خۆی، سێ ساڵە ئەمە کاریەتی پەیوەندی بکەم‌و ئەویش بە بێ دواکەوتن تەلەفۆنێکم بۆ بکرێت.
قسەو بەڵێن تەواو بوو، پارەکەم کردە دەستی، بەلام تا مانگی یەکەم لەگەڵ ئەوەی کارەکان بەرەو تەواوبوون ئەچوون، لە بەستنی تەلەفۆن هەواڵێك نەبوو.
رۆژێك لە رودامانم وەلاناو مەسەلەکەم بە ئەحمەدئاغا گوت!!
ئەحمەدئاغاش بە هەمان دەربڕینی تایبەتی دەڵالانە کە هەموو ئەیزانین گوتی:
"مەحود ئاغا بە گیانی تۆ ئەوەندە کاتم نییە سەرێك لە بەداله بدەم ئەگین ئەمکارە دوو خولەك کاتی ئەوێ"!
بەم رستەیە مانگێکی تر چاوەڕوان بووم! هەموو رۆژێك چاولەڕێ بووین بدەن لە زەنگ‌و بێن تەلەفۆنمان بۆ ببەستن، بەلام لە کۆتایی مانگدا ئیتر کاسەی سەبرم سەرڕێژی کرد بە تایبەتی کە لە ماڵەوە، لە دەست لچ هەڵقورچاندن‌و مڕو مۆچی دایکی منداڵەکان‌و گاڵتەوگەپی منداڵەکان سەبارەت بە هاتن‌و نەهاتنی

تەلەفۆن تەنانەت ببووە گاڵتەبازی دراوسێکانیش! بەیانییەك زوو خۆم گەیاندە نوسینگەکەی ئەحمەدئاغاو گوتم:

ئەحمەدئاغا هەرچۆن بووە کاری ئەو تەلەفۆنە ئەگریسە تەواوبکە.

- بۆ هێشتا تەواو نەبووە؟ بە گیانی خۆت کاك مەحمود ئەمجۆرە کارانە بە هەمووی دوو خولەك کات ئەگرێ.

- بچوکیت ئەکەم وەرە با بەدەست ئەمکارە دوو خولەکییەوە سەرگەردان نەبم.

- زۆرباشە وەرە بابڕۆین.

جێگەتان خاڵی بەرەوە بەداله کەوتینە رێ.

لە فەرمانگەی تەلەفۆنات، بە رێنمایی پرسگە، چووینە یەکێ لە ژوورەکانی پاڵ پرسگە!! تەماشام کرد ئەحمەدئاغا بە یەکەم کارمەندی ژوورەکەی کە لەپشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو گوتی:

ببوورە کاکە، ئەمەوێت تەلەفۆنێك... کابرای کارمەند بێ ئەوەی تەماشای ئەو سکاڵای ئەحەمەدئاغا بۆی راگرتبوو بکات گوتی:

تکایە بۆ نهۆمی دووەم ژووری ژمارە ١٣.

کاتێ لە قادرمەکان سەردەکەوتین ئەحمەدئاغا تەماشایەکی منی کردو گوتی:

- وەرە... ئەمگوت هەمووی دوو خولەك کات ئەگرێ! هەر کە گەیشتینە نهۆمی دووەم ئیتر کار تەواوە!

یانی ئەڵێی تا نیوەڕۆ تەواو دەبێ؟

نیوەڕۆی چی؟ وا ئەزانی شۆخیی ئەکەم کە دەڵێم بە گشتیی دوو خولەك کات ئەگریٚ!! تا ئێستا کە تەلەفۆنەکە نەبەستراوە تاوانی خۆت بووە! ئەگینا هەر کە کارمەندەکان سکاڵاکە ببینن خێرا دێن و ئەیبەستن.

لە ژووری ژمارە ١٢ ی نهۆمی دووەم پێنج شەش کەس لە پشت مێزەکانیان دانیشتبوون. ئەحمەدئاغا بە ڕوی یەکەم کەس کە سەری بەرزکردبووەوە زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

داوای لێبووردن دەکەن دوو مانگە من ژمارە تەلەفۆنێکم...

لای مستەفاخان ە!

شوێنەکەی کوێیە؟

لە ڕاڕەوەکەدا هەر لەم نهۆمە.

پرسیار پرسیار مستەفاخان ممان پەیدا کرد، لە پشت دەرگای ژوورەکەی، ئەحمەدئاغا خەریکی ڕێککردنی سەروسەکوتی بوو، دەستی کرد بە شیرین زمانی:

-بینت کاتیٚ مرۆڤ بزانیٚ چۆن لەگەڵ کارمەندەکاندا هەڵسوکەوت بکات بە زوویی کاری بۆ ئەنجام دەدەن... ئەوانەی دەڵێن کەس کار بە باشی ناکات، تاوانی خۆیانە، نازانن چۆن قسە بکەن!! ئەوان لەگەڵ کارمەندەکان دژایەتی دەکەن، ئێستا هەر گەشتینە لای مستەفاخان کارمان تەواوە!

گەیشتینە ژووری مەبەست، چەند کەس دانیشتبوون، ئەحمەدئاغا لە کارگوزارەکەی پرسی:

براکەم کامیان مستەفاخانە؟
کارت بە کامیانە؟ ئێمە چوار مستەفاخانمان هەیە!!
هەرئەوەندەیان بە ئێمە گوت نازانین کام مستەفاخانە!!
باشە ئێستە بزانم کارتان چییە؟
مامەڵەی تەلەفۆنێکمان کردووە ئەمانەوێت بۆمان ببەستن.
ئەمان کاریان بەستن نییە!
لەوانەیە بڕیار لەمانەوە دربچێ.
زۆرباشە... لە دەستی راست کە چوونە ژوورەوە مێزی سێیەم.
لە هەڵسوکەوتی مستەفاخان دەرکەوت مرۆڤێکی خاوەن ئەزمون و دونیا دیدەیە. ئەحمەدئاغا سلاوێکی لێکردو بە ئەدەبەوە گوتی:
- کاکە تەلەفۆنێك دوو مانگە...
ئاشکرابوو مستەفاخان بە باشی نەیبیست، کاتێ دەستی وەك بڵندگۆ بە گوێچکەیەوە گرتبوو گوتی:
- زۆر داوای لێبووردن دەکەم... کەمێ بەرزتر قسە بکە.
ئەحمەدئاغا کەمێ چووە پێشەوەو هەمان قسەی بە دەنگی بەرز دووبارە کردەوە.
مستەفاخان هەموو قسەکانی ئەحمەدئاغای لە سەرەوە تا کۆتایی بیست و چەند پرسیارێکی لێکرد، چونکە قسەیەکی بۆ کردن نەمابوو سەرێکی باداو گوتی:
- هە...هە..هە... کاکە بەهەڵە هاتوون!! ئەبێ بڕۆنە نهۆمی یەکەم بە دەستی راست ژووری دووەم.

چووینە ئەوێ، ئەوان ئێمەیان نارد بۆ ئێرە.

- مەگەر ناتانەوێ تەلەفۆنەکەتان بگوێزنەوە؟

- نەخێر، گوێزانەوە تەواو بووە، تەنها ئەبێ بیبەستن.

مستەفاخان دەستێکی بە ناوچاویەوە گرتو کەمێ بیری کردەوەو گوتی:

- ژمارە تەلەفۆنەکە بلێن.

ئەحمەدئاغا داوانامەکەی کە ژمارەی تەلەفۆنەکەشی تیا نوسرابوو پێدا.

مستەفاخان ماوەیەك تەماشای کردو دواتر، وەك شتێکی بیرهاتبێتەوە گوتی:

- ئەم ژمارەیە راگیراوە!

- چی؟

- راگیراوە!

- خۆم پێش گوێزانەوەکەی پەروەندەکەیم بینی!

وتەکانی ئەحمەدئاغا کاری خۆی کردو مستەفاخان دووبارە پەروەندەکەی خوێندەوەو گوتی:

- ئاه.. داوای لێبووردن دەکەم من دووم بە سێ خوێندەوە!! ئێوە دەبێ بڕۆنە نهۆمی چوارەم ژووری ژمارە ٢٦ دواتر لە گۆشەیەکی داواکارییەکە شتێکی نووسی و دایەوە دەست ئەحمەدئاغا.

لە ژووەکە هاتینە دەرەوە ئەحمەدئاغا گوتی:

- نەمگوت ئەو کارە هەمووی دوو دەقیقە کاتی ئەوێ!

- وا نازانم تا نیوەڕۆ تەواو ببێ.

- ئەوە دەڵێی چی، ئەو کارە تا نیوەڕۆ دەجار تەواو دەبێ! چ جای بگاتە جارێك، گەیشتینە نهۆمی چوارەم، لە ژووری ژمارە ٢٦ خانمێك کە خەریك بوو سوراوی ئەکرد پەروەندەکەی گرت و گوتی:

- ئەمە چییە؟

- داواکاریی بەستنی تەلەفۆنە!

خانمەکە پێکەنی... ئەحمەدئاغاش پێکەنی، دواتر خانم لە کاتێکدا قەڵەمی لێوەکەی دەخستەوە ناو کیفەکەی تەماشایەکی نوسینەکەی مستەفاخانی کردو گوتی:

- ئەمە چییە؟

- مستەفاخان!!

- چی نووسیوە؟

- نازانم کاغەزەکە بەدەست تۆوەیە، بیخوێنەرەوە!!

- باشە، بەڵام دەقیقەیەك مۆڵەت بدەن بیدەم بە هاوکارانم بیخوێننەوە.!!

- ئەبێتە زەحمەت بۆتان!

- تکا دەکەم کاکە زەحمەتی چی، وەزیفەمانە کاری هاوولاتیان جێبەجێ بکەین!

خانم نامەکەی دا بە هاوکارەکانی تری کە بۆی بخوێننەوە، ئەحمەدئاغا دەستی کرد بە قسەکردن:

- ئەمگوت ئەوەندە بەدگومان مەبە بزانە هەمووی دوو خولەك کات ئەگرێ، هەر کەسێك پەیدا ببێ نوسینەکەی مستەفاخان بخوێنێتەوە ئیتر کار تەواوە.
خانمو هاوکارانی هێشتا ئەیانویست نوسینەکەی مستەفاخان بخوێننەوە!
نوسیبووی: (فەرمان دەدەم تەلەفۆنەکەی بۆ هەڕاج بکەن!)
ئەبابە: بە قیستە، بەقیست.
- نە بەقوربان (گەڕاوەتەوە بۆ فەرمانگەی پەیوەندییەکان..)
هەرکەس ئەتوانێ ئەم رستەیە بە شێوەیەك شی بکاتەوە بیخوێنێتەوە!!
خانم گەڕاوەو داواکارییەکەی داوە بە ئەحمەدئاغا گوتی:
-بە خێرایی کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە، وا گومان ئەکەم ئەم تەلەفۆنە قەت کراوە!
- نە خانم گیان پەروەندەکەی رۆشنە!
- باشە بڕۆنە لای عەلی ئاغا!
- ژوورەکەی لە کوێیە؟
نهۆمی سێیەم ژمارە ٢٣
لە کاتێکدا بە قادرمەکاندا ئەهاتینە خوار گوتم:
- گەر تا نیوەڕۆ تەواو بووایە زۆر باش بوو..
تانیوەڕۆ؟ ئەمکارە هەمووی دوو خولەك کات ئەگرێ! ئێستا کاتژمێر ١١,٥ تۆ ئەتەوێ تا نیوەڕۆ لێرە بین؟

گەیشتینە نهۆمی سێیەم، چووینە لای عەلی ئاغا، ئەویش پەروەندەکەی وەرگرت و تەماشایەکی سەرو سەکوتی ئێمەی کردو گوتی:

- بڕاوە!!

- چی بڕاوە!

- تەلەفۆنەکە!

- بۆچی؟

- بە تاوانی گاڵتەکردن بەخەڵک.

-بە کێ؟

-نازانم، بەندەیەکی خودا!!

- کەی؟

- .. زۆر لەسەری ئەڕۆی کاکە.. دوو ڕۆژ لەمەوبەر!

- لەکوێ کاکە؟ ئەم تەلەفۆنە دوو مانگە گوێزراوەتەوەو تا ئێستاش نەیانبەستووە، چۆن دوو ڕۆژ لەمەوبەر بە خەڵکی ڕابواردووە!؟

- ئەها... تێگەیشتم.. بڕۆنە نهۆمی یەکەم ژووری ١

لەناو ژوورەکەدا کابرایەك خەریکی جوینی سمێڵی بوو! داواکارییەکەی بینی تووڕە بوو:

- بۆچی ڕەچاوی دەستووری زنجیرەی سەردانەکان ناکەن؟! بابە ئەمکارە هەمووی دوو خولەك کات ئەگرێ!! گەر یەکەمجار ئەهاتنە ئێرە ئێستە دەمێکە تەواو بووبوو.

ئەحمەدئاغا پێکەنینێکی بۆ کردو گوتی:

- داوای لێبووردن دەکەم... بمان بەخشن، ئێستا کە وایە گەورەیی بکەو کارەکەمان بۆ تەواو بکە.

- ئەتانەوێ بیبەستێن؟ وانییە؟

- بەڵێ بەڵێ

- ئێستە هەموویان چوون بۆ نانخواردن! سەعات دوو دەگەڕێنەوە، پێویستە داواکارییەکەی ئێوە لە دەفتەردا تۆمار بکرێ، بەڕێوەبەریش فەرمان بدات ئەوکات کار ئەنجام بدەین!

ناکرێ ئێستا کارەکە ئەنجام بدەن؟

- نە دەستوری فەرمانی پێویستە، بەڵام ئێوە نیگەران مەبن، هەمووی دوو خولەك کات ئەگرێ!

ئەحمەدئاغا گەڕاوە لای منو گوتی:

-نەمگوت؟

دواتر روی کردە کابراو گوتی:

-زۆرباشە، کەی بەخزمەت بگەین؟

-عەسر ئەبێ کارەکانی ئەمڕۆ ئەنجام بدەین! بەیانیش ئاغای سەرۆك، کۆبوونەوەی هەیە... ئێوە دووسبەی تەشریف بێنن.

-درەنگ نییە؟

-نەکاکە، جگە لەوەش ئەمکارە هەمووی دوو خولەك کاتی ئەوێ!

زۆر باشە، من ئیتر نارەحتتان ناکەم، ئەمە مەحمودئاغای دۆستی منەو خاوەنی تەلەفۆنەکەیشە، گەر خۆی بێتە ئێرە گرفتێك هەیە؟

-نه هیچ گرفتیٚ نییه!

*******

*ئێستا دوو مانگ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیوە هەموو ڕۆژێک لە بەیانی زووەوە ئەچمە بەدالەو ئێوارە لەگەڵ کارمەندەکان ئەچمە دەرەوە، بەڵام کاری بەستنی تەلەفۆن کە بەقسەی ئەوان هەمووی "دوو خولەك کات ئەگریٚ" (هێشتا تەواو نەبووە!!)

## ژنانی هوشیار ترسناکترن[14]

مستەفابەگ لە هەموو رویەکەوە مرۆڤێکی باش بوو. بە تەواوی مانا مرۆڤێکی تەواو بێ غەش ئەهاتە هەژمار، بەردەوام خەریکی کاری خۆی بوو کاری بەکاری کەس نەبوو، هەندێك لە پاشملە باسیان دەکردو پێیان دەوت:

فلانکەس گێلە

مستەفابەگ لە ژیاندا تەنها ئامانجێکی هەبوو، ئەویش "چاکەکردن بوو لەگەڵ خەڵکی" تەنانەت ئەگەر جنێویشت پێ بدایەو ئازارت پێ بگەیاندایە، ئەو بە جوانی وەڵامی ئەدایتەوەو چاکەی لەگەڵ دەکردی.

[14] لەگۆڤاری شارەزوور بڵاوکراوەتەوە

لە بەرامبەر گرفتەکانی ژیاندا جۆرێك هەڵسوکەوتی دەکرد، هەمیشە نەرمی پیشان ئەدا، بۆ نموونە گەر سەریت لە لاشەی جیا بکردایەتەوە ئەیوت:

بەه.. بەه.. چەندە باشە؟ لە پێشدا یەکێ بووم ئێستە دووانم!!

جارێك نەخۆش کەوتبوو چووبووە لای پزیشك، دوکتۆر وتبووی نارەحەتییەکەی بەهۆی تەسکبوونەوەی دەمارەکانییەوەیەتی، بەڵام هاورێکانی باوەڕیان پێنەدەکردو ئەیانوت: "مستەفابەگ بۆیە ئەم قسانە دەکات کە وا پێشان بدات جێگەکەی نارەحەتە!!"

ئێستا چۆن دەبێ مرۆڤێك بەو خوێنساردییە، جارێك تورە ببێ‌و خراپەی بوو کەسێك بڵێ کە بە هیچ جۆرێ نەیدیوەو نەیناسیوەو چۆن ئاکارو خراپەکانی بووکێ دیاری دەکات، چیرۆکێکە کە ماوەیەك لە کۆڕەکاندا باس دەکرا.

زاوا لە خزمانی مستەفابەگ بوو. ئاشکرایە کەسێك یارمەتی نەناسراوان بدات دەبێ لەگەڵ خزم‌و کەسوکار چی بکات؟ بە تایبەت کە مستەفابەگ لە جێی باوکی زاوا بوو دەیویست پێشوەخت لەگەڵ ئەو مشورەت بکات‌و بۆ ئەو کارە داوای مۆڵەتی لێبکات.

بەڵام ئەمجارە پێچەوانە بوو مستەفابەگ لە جیاتی هاوکاری بووك‌و زاوا، کاسەو گۆزەی ئەوانی تێکشکاندو بە توندی دژایەتی کردن.

بووكیٚ له خیٚزانیكی نه‌دارو ده‌ست كورت بوو... به‌لاّم وانه‌زانی مسته‌فابه‌گ له‌به‌ر ئه‌وه دژایه‌تی ئه‌كرد. به پیٚچه‌وانه‌وه زۆر خۆشحالٚ بوو. هه‌ركات زاوا باسی له باشییه‌كانی بووكیٚ ده‌كرد ئه‌و زیاتر توڕه ده‌بوو، به‌لاّم باشییه‌كانی بووكیٚ یه‌ك‌و دووان نه‌بوو زاوا یه‌ك له‌دوای یه‌ك وه‌ك ته‌جیل به‌رده‌وام ئه‌یژماردن:

"كچیٚكی شه‌رمنه... جلوبه‌رگی سفوری‌و سوراوو سپیاوی ناویٚ، ده‌لیٚ"هه‌رچیم بۆ بكه‌ن پیٚی رازیم. من ژنیٚكی سازاوم."

هه‌ر كه ئه‌م رسته‌ی كۆتاییه له ده‌می زاوا هاته ده‌ر مسته‌فابه‌گ وه‌ك بووركان ته‌قییه‌وه‌و هاواری كرد:

نه‌خیٚر من رازی نیم، كوڕم نابیٚ له‌گه‌لٚ ئه‌و كچه زه‌ماوه‌ند بكه‌یت. خۆت ده‌زانی چه‌نده‌م خۆش ده‌ویٚی. گویٚم لیٚبگره ده‌ستبه‌رداری ئه‌و كچه ببه.

زاوا له سه‌رسوڕماندا خه‌ریك بوو شاخی ده‌ر ئه‌كرد، له‌به‌ر خۆیه‌وه ئه‌یوت:

"مسته‌فابه‌گ ئه‌و كچه‌ی نه‌دیوه، منیش قسه‌یه‌كی خراپم نه‌كردووه. بۆچی وا توڕه بووه؟"

ده‌كریٚ هۆكاره‌كه‌یم پیٚبلیٚت؟

مسته‌فابه‌گ بیٚده‌نگ بوو، پاشان به ئارامی وه‌لاّمی داوه:

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بیٚچاره ده‌بیٚ!!

ئاخر بۆچی مامه‌گیان؟

مستەفابەگ نەیتوانی وەڵامی (بۆچی)یەکەی بداتەوە، بەڵام چونکە کوڕەکەی خۆش دەویست وتی:

زۆرباشە ئێستا بۆت باسدەکەم، بەڵام ئەو ئازارەی ساڵانێکە لەبیرم کردووە دووبارە تازە دەبێتەوە!.. ئایا دەزانی بۆچی رەبەنمو ژن ناهێنم؟

زاوا بێدەنگ بوو چونکە نەیدەزانی، مستەفابەگ هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەردەوام بوو:

لەبەر ئەوەی منیش کچێکی وەك ئەوەی تۆم پەیداکردو دەمویست بیکەمە هاوسەری ژیانم. ئەویش لە سەرەتاوە لەم قسانەی دەکرد... لە جلوبەرگی مۆدەو... ئەشیای جوانکاریو گرانبەهای نەدەویست. لەو ژنانەی کە خۆیان دەڕازاندەوە بێزار بوو. هەرچۆن بێت کچێکی رۆشنبیرو تێگەیشتوو بوو دەیوت:

"رەنگو رۆن تێساوین کاری ژنانی سەردەمی زووەو نیشانەی وەحشگەری مرۆڤە.. ئەم رۆژانە ژنان لەبەر ئەوەی سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان رابکێشن ئەو کارانە دەکەن!"

بەتایبەتی زۆر رقی لە گوارەو گەردنبەندو بازنگی دەستی ژنان بوو، ئەوەندە پێکەوە گونجاو بووین سنوری نەبوو. تەنانەت نەیهێشت شایی بگێڕینو خەرجی زیادە بکەین، بە بڕێکی زۆرکەم زەماوەندەکەمان کردو دوو سێ کەس لە خزمان بووکیان بۆ ماڵی من هێناو هەر لەبەر دەرگاکە ماڵئاواییان کردو رۆشتن...

لە رۆژە یەکەمەکاندا زۆر بەختەوەر بووم، ئەو هەمان نیعمەتی خودا بوو کە بە نسبیی کەم کەس دەبێ، بە هیچ جۆرێک هەڵەخەرجی لە ماڵی ئێمەدا نەدەکرا..

رۆژێك حەزم کرد جوتێك گۆرەوی بۆ ژنەکەم بکڕم، بریا دەستم بشکایەو ئەو کارەم نەکردیایە تەواوی بەدبەختی من لەوەو سەرچاوەی گرت.

ساڵێك بەسەر هاوسەرێتی ئێمەدا تێپەڕی کرد، تا ئەو کاتە پێی نەوتبووم: "ئەوەم دەوێ ئەوەم ناوێ" ئەوەی پێویستی بووایە خۆی دەیکڕی، منیش لەوکارە هەم خۆشحاڵبووم هەم ناڕەحەت! هۆکاری دڵگرانییەکەی من ئەوە بوو منیش وەکو پیاوانی تر غرورم هەبوو حەزم دەکرد شت بۆ هاوسەرەکەم بکڕم، بەڵام پارەم نەبوو. دەرامەتەکەم بە زەحمەت خەرجییەکەمانی تەواو دەکرد. پەندێ هەیە دەڵی .(لەتە سێوێك مرۆڤ تێر ناکات، بەڵام خۆشەویستی زیاد دەکات) بە خۆمم وت: "با جوتێك گۆرەوی بۆ بکڕم" چوومە دووکانێك دڵم دەیویست ژنەکەم هەرچی شتی باشە لە منی وەرگرێ. جوتێك گۆرەوی جوان‌و گرانبەهام بۆ کڕی..

وادەزانی لە بینینیان خۆشحاڵ بوو، نەخێر، تەنها سوپاسێکی وشکی لێکردم، منیش لەبەر خۆمەوە وتم "مانای چی؟ گۆرەوییەکان گرانبەها بوو بۆچی خۆشحاڵ نەبوو؟"

ماوەیەك بەسەر ئەو رووداوەدا تێپەڕی، بەڵام لەم ماوەیەدا بۆ جارێکیش چییە گۆرەوییەکانی لە پێ نەکرد، هەمیشە گۆرەوییە ئاساییەکانی تری لەپێ دەکرد. دڵگران بووم. جلوبەرگێك کە پیاو بۆ ژنی دەکڕێ پێیخۆشە لەبەریا ببینێ.
باشە ژنەکەی من کەی دەیەوێت ئەو گۆرەویانە لە پێ بکات؟
دووبارە لەبەر خۆمەوە وتم:
" لەوانەیە دڵی نەیەت لە پێی بکات هەڵیگرتبێ بۆ میوانیو ئاهەنگو شتی وا."
بە ڕێکەوت بۆ دوو سێ میوانیو زەماوەند بانگ کراین، بەڵام دیسان ژنەکەم گۆرەوییەکانی لە پێی نەکرد.
ئیدی کاسەی سەبرم سەرریژی کردو پرسیم:
بۆچی گۆرەوییەکان لە پێ ناکەیت؟
وەڵامی داوە:
خۆشەویستم لەگەڵ ئەو پێڵاوە کۆنانە چۆن دەکرێ ئەو گۆرەوییە گران بەهایە لە پێ بکەیت؟ دەبێ پێڵاوەکانیش هاوتای خۆی بێت.
بینیم راست دەکات بەهەر زەحمەتێ بوو جوتێك پێڵاوی پاژنەبەرزم بۆ ژنەکەم کڕی کە لانی کەم لەگەڵ گۆرەوییەکانی ڕێکبکەوێت.
هەر دووکمان حەزمان لە پیادەرەوی هەبوو. رۆژانی پشوو چونکە پارەمان نەبوو نەماننەتوانی بچین بۆ جێگەیەك. دوو سێ سەعات

بەناو شەقامەکاندا پیاسەمان دەکرد. بەڵام لەو ڕۆژەوەی ئەو پێڵاوە پاژنە بەرزەم کڕی بەرنامەی پیاسەکەمان کۆتایی هات. لەبەر ئەوەی ژنەکەم بەو پێڵاوە پاژنە بەرزانەوە نەیدەتوانی بەسەر شوستەکاندا بڕوات تەنانەت سەردانی هەندێ لە خزمانیش کە دەمویست بڕۆین ژنم دەیوت:

پێڵاوەکانم بۆ قاچم نارەحەتە دەبێ سوار تەکسی بین. منیش چون ئەمویست هەرچی شتی باش هەیە بۆ ژنەکەمی دابین بکەم، رازی بووم‌و هەمیشە بە تەکسی هاتوچۆمان دەکرد.

لەبەر پیادەرەویی خانم جوتێك پێڵاوی فلاتم بۆ کڕی، ئەوکات ژنەکەم وتی:

ئەو پێڵاوە جوانانە دەبێ لەگەڵ پانتۆڵ لە پێ بکرێ!

پانتۆڵم بۆ کڕی، وتی:

دەبێ بلوزێکی مل قەپاتی بۆ بکڕم.

بلوزیشم کڕی... ئێستا ئیدی کڵاوی دەویست... دواتریش جانتای شانی گۆڕی دوا شتیش "ئاشارپ" یشم بۆ کڕی. کار بە جێگەیەك گەیشت ناچار بووم لە سندوقی فەرمانگە بڕێك پارە بە قەرز وەربگرم... بەڵام بۆچی بەوەش کۆتایی هات؟

بینیم دیسان خانم بۆڵە بۆڵیەتی‌و ئامادە نییە لەماڵ بێتە دەر...

هۆکارەکەیم پرسی وتی:

ئازیزەکەم تۆزێك ویژدانت بێ.. بەم جلوبەرگەوە چۆن دەتوانم لە ماڵ بێمە دەر؟

بە سەرسوڕمانەوە پرسیم:
بۆچی ئەو جلوبەرگانە چییانە؟
ئای... پێڵاوو جانتاو کڵاوی نویٚ چۆن لەگەڵ ئەو جلوبەرگە کۆنە ڕێك دەکەوێت؟
چونکە دەمویست ژنەکەم ئارەزووی هەرچی بکات بۆی دەستەبەر بکەم. چومە دووکانێکی قوماش فرۆشی. بە نیوە قەرزو نیوە نەخد دەستێك لیباسی گرانبەهام بۆ کڕی، دام بە بەرگدرویەکی باش، بەڵام دیسان رازی نەبوو، لەبەر ئەوەی تا جلوبەرگەکە ئامادە بوو وەرزی زستان هات و پێڵاوەکان کۆن بوون!
ئەو کات جوتێك پێڵاو کە لەگەڵ جلوبەرگەکانی ڕێك بکەویٚ بۆم کڕی.. بەڵام دیسان نە جلوبەرگی پۆشی نە پێڵاوی کردە پیٚ..
دیسان هۆکارەکەیم پرسی.. ژنم کە پێشتر بە هیچ جۆری سەری لەو کارانە دەرنەدەکرد، وتی:
ئەم لیباسانە جوتێك دەستکێشیشی دەویٚ... دەبووا چیم بکردایە؟.. قسەی ڕاست وەڵامی نییە... خۆم دەمویست هەرچی دڵی بیخوازیٚ بۆی دەستەبەر بکەم!
کاتیٚ هەموو شتیٚ ئامادە بوو ڕۆژێك لەدەمی عەسردا ژنەکەم لیباسەکانی پۆشی و ویستی بڕواتە دەرەوە. وتم:
دەتەویٚ بۆ کویٚ بڕۆیت؟
ناتوانم بەم قژە ئاڵۆزکاوەوە بچمە نێو شەقام دەبێت بڕۆم بۆ ئارایشگا بۆم ڕێك بخات!

منی بێچارە لەبەر دەستپێوەگرتن و کەم خەرجی هەر دوومانگ جارێك دەچومە دەلاکخانە. بەڵام وای لێهات خانم هەر دوو هەفتە جارێك دەچووە ئاریشگا.

بەیانییەکیان ویستم بڕۆم بۆ سەر کار خانم وتی:

تۆ چۆن پیاوێکی کە هیچ بیر لە ژنەکەت ناکەیتەوە؟

نازانی ژن خەرجی دەوێ... سوراوی دەوێ... سپیاوی دەوێ، ئەوانەشم کڕی هەڵبەت لە باشترین جۆر.. بەڵام کەم کەم دەکەوتمە ژێر باری گرانی قەرزاری... شەوێك کە گەڕامەوە بۆ ماڵ ژنەکەم بە ئەندازەیەك گۆڕابوو وەخت بوو نەیناسمەوە، قژی ڕەنگ کردبوو شێوەی برۆو برژانگی گۆڕیبوو... خاڵێکی گەورەو ڕەشی لەسەر گۆنای کێشابوو ئەدرەوشایەوە.

پێم وتی پێشتر لە گەردنبەند خۆشی نەدەهات، بەڵام ئێستا هەر ڕۆژەو جۆرێك دەکاتە گەردنی و .هەرکارێك بیویستایە دەیکرد، ئێستا ئیدی لە مۆدێل کەمی نەبوو!

لەبەر جلە تازەکانی ژنەکەم ناچار بووم کۆمیدێك بکڕم... بۆ ئەوەی تەپ و تۆز نەگرێ دەبووایە گسکێکی کارەبایم بکڕیایەو بۆ ئەوەی ژنەکەم هەموو ئەندامی بە جوانی ببینێ دەبووایە مێزێکی "تەوالێتی" بۆ بکڕم، لەمەو دواش دەبووایە جلوبەرگەکانی بە ماشینی جل شۆرین" بشۆردایە.

ئاخریەکەی ماڵێکی بچوکم هەبوو فرۆشتم و ئەوانەم بۆ دەستەبەر کرد... ڕۆژێك دیسان ژنەکەم نیگەران بوو دووبارە پرسیم:

ئیتر چیت دەوێت؟
دەستێکی جلی شەوم پێویستە..
لە سەرسوڕماندا زۆری نەمابوو شاخم لێبڕوێ و پرسیم:
لیباسی شەوت بۆ چییە؟
شەوان نابێ بەو جلوبەرگانەوە بچیت بۆ میوانی!
لەبەر خۆمەوە وتم "بەدەرەك با ئەوەشی بۆ بکڕم ژنەکەم لە هیچ کەمی نەبێ.." بەڵام تەنها جلوبەرگەکە بەس نەبوو پێڵاوو جانتایی تایبەتی دەویست!
کاتێ ئەوانەشم کڕی ژنەکەم وتی:
ئەم ماڵە زۆر ناخۆشە... مرۆۋ لەبەردەم میواندا خەجاڵەت دەبێ و دەبێتە دڵۆپێك ئاو.
ماڵێکی گەورەم گرت... هەموو شتی نێو ماڵەکەم گۆڕی. خانم دیسان پرتەو بۆڵەی دەهات، پرسیم:
ئیدی چیت دەوێ؟
دەبێ کارەکەرێك بگرین کارەکان ئەنجام بدات.. چون دەمویست هەرچی دڵی دەخوازێ بۆی جێبەجێی بکەم کارەکەریشم بۆ هێنا. بەڵام بۆچی کەموکوڕییەکانی ژیان تەواو دەبێ؟ ئێستا ئیدی ژنەکەم ئۆتۆمبێلی دەویست... من کە ماڵ و سامان و پاشەکەوتم لەبەر خانم لەدەستدابوو تا بینە قاقام لەقەرزدا چەقیبووم، بۆ یەکەمجار بوو دژایەتیم کرد:
نە، ئیدی ناتوانم لەگەڵ تۆ بژیم!

مستەفابەگ ئالێرەدا بێدەنگ بوو، گەرووی گیرابوو. زاوا پرسی:
سەرئەنجام چی بوو؟
هیچ منی بەجێ هێشت!
پاشان زەردەخەنەیەکی تاڵی بۆ کرد:
پیاوان هەمیشە فریوی سادەیی ژنەکانیان دەخۆن. کاتێ هەموو شتێکیان لەبەر خاتری ئەو لەدەست دا، تازە تێدەگەن چ هەڵەیەکی گەورەیان کردووە. کاتی رۆیشتن وتم:
ئەی ژن تاوانی من بوو کە نەمدەویست خواستەکانی جێبەجێ نەکەم، بریا رۆژی یەکەم ئەو گۆڕەویانەم بۆت نەکڕیایە؟!
ژنەکەم بە بێ ئەوەی تەماشای من بکات بە دەنگی بەرز پێکەنی:
دەتتوانی نەیکڕی، کێ پێی گوتبووی بیکڕە؟
مستەفابەگ کە قسەکانی تەواو بوو بێدەنگ بوو.. زاوا وتی:
بەڵام مامەگیان ئەم لەوانە نییە. هیچی لە من ناوێت، کچێکی رۆشنبیرە!
مستەفابەگ پێکەنینێکی گاڵتەجاڕانەی بۆ کرد:
هۆشمەندەکان ترسناکترن هەر بەو جۆرەی پێش لە زەماوەند قسە دەکەن، دوای زەماوەندیش هۆشیارانە دەتخەنە داو!
ئێستا ئیدی خۆت دەزانی. گەر دەتەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکەیت ئاگاداربە گۆڕەوی بۆ نەکڕیت، تا ژیانت لەدەست نەدەیت.

## گەڕەکەکەی ئێمە

گەڕەکەکەی ئێمە کەوتۆتە کۆتایی شارەوە، نزیکەی بیست خانووی قوڕین لە پەنای یەکدا بەبێ نەخشەو ئەندازیار دروستکراون‌و شێوەی بن بەستی هەیە. شەقامەکەی ئێمە دوازدە ماڵی لەسەرە...دواتر لارو گێڕ دەبێ‌و کۆتاییەکەشی چەپەری باخێکە.

گەڕەکەکەی ئێمە بە درێژایی شەوو ڕۆژ چۆڵە، هەندێ جار ئۆتۆمبێل‌و عارەبانە تەنانەت مرۆڤی بێگانەی پێدا تێئەپەڕی...

زیاتر ڕێبووارانی گەڕەکەکەی ئێمە، ڕێبووارانێکن عارەبانەی دەستی پڕ لەخۆڵیان پێیەو لە شوێنێك لە پەنای شەقامەکەی ئێمە کە تایبەتە ڕشتنی زبڵ ئەیرێژن.

بۆنێکی تایبەت لە زبڵەکەوە بڵاودەبێتەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی گەڕەکەکەی ئێمە. لە ڕۆژانی گەرمی هاویندا ئەم بۆنە توندتر دەبێ... بە جۆرێك مرۆڤ وا هەست دەکات لاکەو

بۆگەنی کردووە... هەر کە هەوا هەڵدەکات ئەم بۆنە وەکو روبار بەناو شەقامەکەی ئێمەدا بڵاو دەبێتەوە... لەم کاتانەدا دەبێ پەنجەرەکان جوان دابخەین و لە نێو هەوای گەرمی ماڵەکاندا خۆمان زیندانی بکەین!

گەڕەکەکەی ئێمە تەنانەت کارەبایشی نییە، تەنها مزگەوت و دوکانێکی بچوک کە هەموو شت دەفرۆشێ کارەبایان هەیە، ماڵەکانمان چرای نەوتی دادەگیرسێنین.

گەڕەکەکەی ئێمە ئاوی نییە، عەسران ژنان و کچان گۆزە هەڵدەگرن و دەچن بۆ ئاو بۆ بیرێك کە لە گەڕەکەکەی ئێمەوە زۆر دوورە، بۆ پێداویستی شەوانەیان ئاو دەهێنن.

دوای ئەوەی ئاوەکەیان هێنا کاری رۆژانەی ژنان تەواو دەبێ، ئەوان لەناو دەرگای ماڵەکانیان رۆدەنیشن و زەمی یەکتر دەکەن.

دانیشتوانی شار کەم کەم زیاد دەکات، بەڵام لەگەڕەکەکەی ئێمە هیچ کات گۆڕانکاری رونادات. مرۆڤەکان هەمیشە یەك ئەندازەو یەك شێوەن.

راستی کە جێگەی ئەحمەد ئەکبەر ئەیگریٚ و جەلال دەڕوا ئیحسان دێت، بەڵام دەڵێی هەموویان کۆپی یەکترین و هەر ئەوانەن کە رۆیشتوون.

تەنها ئەوانەی دەوڵەمەند دەبن و دەیانەوێت گوزەرانی خۆیان بگۆڕن لە گەڕەکەکەی ئێمە دەڕۆن، ئەوانی دیکە باری ژیانیان نەگۆڕەو لە جێگەی خۆیان دەمێنن... لەم رووەوە لە شەقامەکەی

ئێمە ژیان هەمیشە وەك رابردوو ئەگوزەرێ بە هەمان فەرامۆشی، هەمان بێدەنگیو هەمان بێچارەیی! لێرە هەر خێزانێكماڵێکی بچوکی هەیە، ژیانی رۆژانە هەستو نەستیانی والێکردوە هەموو ئەندامانی گەڕەك وەکو ئەندامی خێزانێکیان لێهاتووە.

لێرە ژیان بە کات بەڕێوە ناچێ... بەڵکو کارەکان لە روی خۆرەوە رێك دەخرێ!! چ لە زستان..چ لە هاوین کاتژمێر چۆن دەڕوا با بڕوا لەگەڵ ئاوابوونی خۆر منداڵەکان هاوار دەکەنو ژنانیش چاوەڕوانی مێردەکانیان دەکەن بگەڕێنەوە ماڵەوە، سەرەتا خۆڵەکە ببەنە دەرەوە، دوایی ئاوی خواردنەوە بهێنن دواتر دەرگای ماڵەکانیان ببەستن!! وردە وردە تاریکی باڵ بەسەر گەڕەکەکەی ئێمەدا دەکێشێ... لە تاریکیدا شەقامەکەی ئێمە تەنگتر دەبێ، هەتا بەیانی هیچ شتێ بێدەنگی گەڕەکەکەی ئێمە ناشکێنێ!

تەنها جارێك ئەم بێدەنگیو خامۆشییە شکا... شەوێك نزیك نیوەشەو دەنگێکی نائاسایی لە گەڕەکەکەی ئێمەدا بەرگوێ کەوتو قیرەیەکی بەهێزی ژنانە بێدەنگی شکاند.

رامکردە قەراغی پەنجەرەکە لەناو شەقامەکەدا لەو جێگەیەی قەمچ دەبووەوە خەڵکێکی زۆر کوبووبوونەوە. دەرگای ماڵەکان بەخێرایی ئەکرانەوەو پیاوەکان لە کاتێکدا لایتیان بەدەستەوە بوو بەترسو لەرزەوە ئەهاتنە دەر. رۆشنایی کەمڕەنگی چراکان

شەقامەکەیان روناککردبووەوە. وام هەست دەکرد روداوێک رویداوە بە خێرایی جلەکانم لەبەر کردو رامکردە دەرەوە.

تۆنگۆ یەکێ لە ژنانی گەڕەکی ئێمە بوو، مێردەکەی شۆفێری ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر بوو خەریک بوو منداڵی دەبوو.

رەجەب رۆژێك لەوەوبەر باری بۆ یەکێك لە شارەکانی تر بردبوو، ژنەکەی یەکەم بە خوداو دواتر بە دایكو دراوسێکانی سپاردبوو.

ژنانی دراوسێ کاری خوشکانەی خۆیان ئەنجام دابوو.. بەڵام کار بەشێوەیەکی تر بوو " قابلە" دوایی ماوەیەك هەوڵو تێکۆشان وتبووی" منداڵەکە ئاسایی نییەو هیچ کارێکم لەدەست نایە، خێرا پزیشکی بۆ بهێنن".

دوو سێ کەس چوو بوون بەدوای پزیشکدا... ئەوانی دیکە بە رەنگی پەڕیوو دڵەلەرزە لەناو کۆڵانەکە چاوەڕوان بوون!.

لەناو ماڵەکە دەنگی زریکەی ژنەکان بەگوێ ئەگەیشت. دەنگی هاوارو ناڵەی ژنەی بێچارە ئەو ناوەی پڕ کردبوو ئاشکرابوو زەجرێکی زۆر دەکێشێ.

لێوی پیاوەکان ئەجولایەوە.. دیاربوو خەریکی نزا خوێندنو داوا لەخوای تاقانە دەکەن. کە هەر ئەو دەناسن بەزەیی پێدابێتەوەو رزگاری بکات.

نیو کاتژمێر تێپەڕی لە هاتنی پزیشك هەواڵێك نەبوو. لەپڕ تروسکایی ئومێد دڵی هەموانی رۆشن کردو دەنگی ئۆتۆمبێلێك گەیشتە گوێ. ئۆتۆمبیل لەوسەری شەقامەکە دەرکەوت. پیاوەکان

بەرەو ئۆتۆمبیلەکە رایانکرد. هەر کە ئۆتۆمبیل وەستا دەستی شەقارشەقاری پیاوان هەر چوار دەرگای ئۆتۆمبیلەکەیان کردەوە بۆ پیادەبوونی پزیشك. هەروەك کەسێ فریشتەی رزگاری خۆی هاتبێ، هەمووان سەریان دانەواندو بەرێزەوە پێشوازییان لە پزیشك کرد.

پزیشکەکە بە خێرایی چووە ناو ماڵەکەو بە دەنگێکی ئارام پرسی:

ژنەکە لە کوێیە؟

دوو سێ دەنگی ژنانە بە یەکەوە وتیان:

ژووری سەرەوە.

پزیشك تەماشایەکی دەوروبەری کردو پرسی:

گەورەی ماڵ کێیە؟

دایکی رەجەبیان نیشاندا، پیاوەکان لەبەردەم دەرگاکەدا وەستابوون‌و گوێیان لەم قسانە گرتبوو.

پزیشکەکە بە پیرەژنەکەی وت:

خانم گیان من دەمەوێت راست‌و رەوان بڵێم، هەقدەستم (٥٠)لیرەیە گەر نەشتەرگەریشی بوویت (١٥٠) لیرەیە.

ئەگەر دوکتۆر لە ماڵی خۆیدا ئەم قسانەی بکردایە بیرێکی تری بۆ ئەدۆزرایەوە، ئێستەو لەم کاتە ناسکەدا هیچ رێگە چارەیەك نەدەدۆزرایەوە.

پیرەژن هەروەك كارەبا گرتبێتی وشك بوو بوو... قسەكە لە گەرویدا گیرا بوو هەر چۆن بوو هاتە قسەو وتی:

چۆن؟ ٥٠ لیرە! ئەوەندە... نەیتوانی قسەكەی تەواو بكات.

دوكتۆر وتی:

بەڵێ... باشترە مرۆڤ لەپێشدا تەی بكات، تا دوایی تووشی قیڕە قیڕ نەبێ.

یەكێ لە ژنەكان وتی:

دوكتۆر ئێمە پارەیەكی وامان نییە، هیچ كاتیش نەمانبووە ئێمە دەتوانین (٢٠) لیرەت بدەینێ.

بێسودە... لەوانەیە كەسێكی تری پێ رازی ببێ، بەڵام من داوای لێبووردن دەكەم.

ژنێكی تر لە تاریكیدا وەستابوو ئارامی نەماو هاواری كرد:

ئاغای دوكتۆر مێردی ئەم ژنە رۆژانە مووچەكەی ١٥ لیرەیە.

ئەوە پەیوەندی بە منەوە نییە!

دوای ئەم قسەیە، دوكتۆر گەڕایەوە دواوە كە بچێتە دەرەوە. پیاوەكان هەروەك چۆن بێدەنگو ئارام وەستابوون ئاواش شان بەشانی یەك رێگەیان بەستبوو. ئیدی دەنگو هەرای تۆزێ لەمەوبەر نەمابوو... تەنها دەنگی هەناسەی تورەیی پیاوەكان بەرگوێ دەكەوت، هەموو گیانیان لە تورەییدا دەلەرزی، دەستەكانیان نوقاندبوو.

دوکتۆر چەند هەنگاوێك بەرەو دەرگاکە رۆیشت، بەڵام نەیوێرا لە ناوەڕاستی پیاوەکانەوە بڕوات.. وەستا بە هێواشی بە یەکیانی وت:

مۆڵەت بدە بڕۆم.

پیاوەکە لە جێگەکەی نەجولا... دوکتۆر بە یەکێ تریانی وت، بەڵام ئەویش وەکو پەیکەر لە پزیشك رامابوو، ویستی پاڵ بەیەکیانەوە بنێ، بەڵام دەستی بەر بازوویەکی پۆڵاین کەوت. تەماشای چواردەوری خۆی کرد، چەند پەیکەرێکی رەنگ پەڕیو سنگیان، بەرامبەری دەرپەڕاندبوو...

پزیشکەکە هیچی نەوت، لە پلیکانەکانەکان چووە سەرەوە! لەم کاتەدا دەنگی تووڕە لەدوایەوە بەرزبووەوە:

دوکتۆر!!

دوکتۆر وەستاو ئاوڕی داوە. پیاوە تووڕەکە هاواری کرد:

دوکتۆر لەبیرت بێ گەر موویەك لەسەری هەرکامیان کەم بێ هیچ بەهانەیەك وەرناگیرێ.

پزیشکەکە لە چەند پلەیەکی تر سەرکەوت و چووە ناو ژوورەکە... کەم کەم بێدەنگی گەڕایەوە، پیاوەکان کەمێ وزەیان تێ هاتەوە. یەکیان وتی:

تەماشاکە بۆ یەك سەعات کار... ٢٠ لیرەی پێدەدەین ناڕازییە. لەگەڵ ئەوەی ئێمە بۆ هەر کاتژمێرێ ١ لیرە وەردەگرین.

لەم کاتەدا زریکەیەکی بەهێز لەناو ژوورەکە گەیشتە گوێ.

دڵی پیاوەکان داخورپا، بەڵام دوای بیستنی گریانی کۆرپەکە زەردەخەنە کەوتە سەر روخساریان. هەموان بێدەنگ بوون...
ئێستا بڵێ بزانم ئێستا دەبووایە چی بووایە؟!!!
چارەکێك درێژەی نەکێشا کە قابلە لە ژوورەکە هاتە دەرو لەسەر پلەکان هاواری کرد:
سوپاس بۆ خوا نەجاتی بوو، هەروەك چوارپلیان ئۆتۆماتیك بێ، دەستیان لە لاشەیان جیابوویەوە... هەموو پیاوەکان دەستیان‌و سەریان بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە.
"سوپاس بۆ خوا"..."سوپاس بۆ خوا" چرکەیەك دواتر پزیشکەکە لەهەمان پلەکانەوە هاتە خوارو وەکو پێشتر زەردەخەنە لەسەر روخسار نەبوو.
هەمدیسان بە بەردەم کۆمەڵەکەدا تێپەڕی، بەڵام ئەم جارە رێگەکەی ئازاد بوو هیچ کەسیش بە دوای دوکتۆردا تا لای ئۆتۆمبیلەکە نەچوو ماڵئاوایی لێبکات...

## قابیلی نییه[15]

لاوێکی چوارشانە بەسەری شکاوو دەستو قاچی بەستراو چووە نێو ژووری هاوڕێ پارێزەرەکەی.
پارێزەر بە بنینی ئەو حاڵە لەجێی خۆی وشك بوو، پرسی:
ئەوە چییە؟ چی بووە؟
هاوڕێی خۆشەویستم منیش.لەبەر ئەوە هاتوم... پەروەندەیەکم بۆ ساز بکەی، نازانی لە چ حاڵێکدام، بەڵام تا بەسەر خۆت نەیەت نازانی چیم بۆ بکەیت، هەر ئەوەندە لەگەڵ ئەمو ئەو قسەم کرد، باوکمیان لەگۆڕ دەرهێنا.
دانیشەو پێم بڵێ با بزانم چی بووە؟
بەگوتن ناکرێ...
بۆچی؟

---

[15] لەگۆڤاری شارەزوور بڵاوکراوەتەوە

چونکە ئەو شتانە ناوترێ، دەبێ بەسەرت بێت تا تێبگەیت ئەگینا بە باسکردن رێك ناکەوێ!

بابەگیان تۆ ڕووداوەکە باس بکە من تێدەگەم.

وتم ناتوانم باسی بکەم. یانی ناکرێ... بەوتن ناکرێ. من ئێستە زۆر هیلاکمو ناتوانم بەپێوە بووەستم، دەبێ برۆم لەماڵەوە پشوو بدەم...

من بێم بتگەیەنم!

نا خۆم دەڕۆم... کەی دێیت بۆ لام؟

پارێزەرەکە تەماشای رۆژمێری سەر مێزەکەی کرد تابزانێ چ رۆژێ لە دادگا کاری نییەو وتی:

سێشەممە بەیانییەکەی دێم. گەر پێویست دەکات زووتر دێم.

سێشەممە باشە. تەنها مەولبدە بێیت.

ئەحمەد خوداحافیزی کرد، پارێزەر کەوتە ناو بیرکردنەوە:

"لەوانەیە لێدانێکی باشی خواردبێ، بەڵام ئەوەی لێیداوە دەبێ غولێك بووبێ"[١٧]

بەیانی رۆژی سێشەممە پارێزەر چوو بۆ نووسینگەی هاوڕێکەی. ویستی هەرچی زووترە لە مەسەلەکە تێبگات.

بەڵام ئەحمەد دیسان قسەکانی پێشتری دووبارە دەکردەوە:

وتم بە قسە نابێ. دەبێ بە چاو بیبینی.

ئاخر چۆن ئەو کارە بەسەر من دێت؟

ئاسانە، شتێکە رۆژانە بەسەر هەموو کەسێ دێت.

گومانی پارێزەر گۆڕا بە ترس. لە قسەکانی هاوڕێکەی کەوتە گومانەوەو پرسی:
یانی سەرو کەللەم دەشکێنن؟
زۆر بیری لێ مەکەرەوە ئەو ڕووداوە منی عاقڵ کرد.
پارێزەر زۆر شتی هێنایە بەرچاوی خۆی لەپڕ شتێ بە مێشکیدا هات:
نەکا لەگەڵ ژنێك دەستت تێکەڵ کردبێ‌و مێردەکەی پێ زانیبێ؟
خۆت دەزانی من لەو جۆرە کەسانە نیم.
ئەی چییە؟
پەلە مەکە تێدەگەیت.
قاوەیەکیان خواردەوەو کەمێ تر پێکەوە وتووێژیان کرد، دەربارەی سیاسەت، بازرگانی. هەواڵەکانی دەرەوەو ناوەوە. بەڵام سەرئەنجام بەهیچ نەگەیشتن. لەم کاتەدا پینەچییەك هاتە ناو نوسینگەکەو پرسی:
کارێکت نییە؟
ئەحمەد لە پارێزەرەکەی پرسی:
پێڵاوەکانت بزمارڕێژیان ناوێت؟
پارێزەرەکە وەڵامی نەدایەوە، هاوڕێکەی وتی:
خێرا، کە ئەو هاتووە پێڵاوەکانتی بدەرێ بزمارڕێژی بکات.
قسەی بە جۆرێك کرد، پارێزەر هیچی نەوت، پێڵاوەکانی داکەندو دای بە وەستاکەو پرسی:

چەند دەکات؟

گرنگ نییە! هەرچەند پێت خۆشە بیدە.

پارێزەر دوولیرەونیوی خستە سەر سندوقەکەی. کاتێ بینی پارەکە هەڵناگرێ پرسی:

کەمە؟

بڵێم چی.

ئەی چەندت بدەمێ؟

لیرەیەکی دیکەی خستە سەر سندوقەکە... پینەچی هەر وەك گاڵتەیان پێکردبێ بەتوڕەییەوە پارەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت.

پاش چەند خولەکێك بۆیاخچییەك هات و ئەحمەد دووبارە وتی:

ناتەوێ پێڵاوەکانت بۆیاغ بکەیت؟

قسەکردن بێسود بوو پارێزەرەکە تێگەیشت هاوڕێکەی مەبەستێکی هەیە، پێڵاوەکانی داکەند، دوای ئەوەی بۆیاغچی. هێنایەوە، پارێزەر پرسی:

کوڕی باش چەند دەکات؟

گرنگ نییە! هەرچەند حەزدەکەیت بیدە؟

پارێزەر لیرەیەکی خستە بەردەمی، تەماشای کرد هەڵی ناگرێ پرسی:

بەس نییە؟

بە بڕوای تۆ باشە.

پەنجا قورووشی تریشی پێدا، بەڵام هەروەك كەسێك مافی خواردبێ بەتوڕەیی چووەدەر، پارێزەر دەستی كرد بە قرەقڕ:
باشترین بۆیاغچی شار ٧٠ قورووش وەردەگرێ. ئەو كوڕە لیرەو نیوێكی وەرگرتووەو كەچی ناڕازیشە.
داربڕێك لە شەقامەكەوە تێپەڕی، ئەحمەد بانگی كرد:
وەرە كۆتەدارێكمان بۆ بشكێنە.
بەچاوان.
داربڕەكە چووە نێو حەوشەی پشتەوە، پاش نیو كاتژمێر گەڕایەوەو وتی:
تەواو بوو.
ئەحمەد بە پارێزەرەكەی وت:
من پارەی وردەم پێ نییە، دەكرێ تۆ پارەكەی پێبدەیت؟
پارێزەر لە داربڕەكەی پرسی:
چەندت بدەمێ؟
هەرچەند مەیلتە.
پێنج لیرە باشە؟
كاكەگیان دارێكی گەورە بوو.
حەوت لیرەو نیوت بدەمێ!
داربڕەكە وەڵامی نەداوە، پارێزەرەكە دە لیرەی پێدا، لە روانینی كابرا دەركەوت رازی نییە. ئەحمەد وتی:
هەستە بڕۆین نانی نیوەڕۆ بخۆین.

سوار ئۆتۆمبێل بوون رۆیشتن بۆ چێشتخانەیەکی چۆڵ لەبەردەم چێشتخانەکە دابەزین هەرچەند ئەحمەد ئەوی دەعوەت کردبوو، بەڵام دەستی نەکرد بە گیرفانیدا. پارێزەر لە شۆفێرەکەی پرسی:

کرێکەت چەندە؟

قابیلی ئێوەی نییە! هەرچەند پێتان خۆشە.

کاکە پێویست بەوە ناکات، چەندت دەوێ بتدەمێ.

پێم وتی قابیلی ئێوەی نییە، هەرچەندت پێخۆشە بیدە.

بۆچی تەکسیمەترەکەت کار ناکات؟

خراپ بووە.

بەڵێ دەزانم تەکسی مەتری هەموو تەکسییەکانی ئەستەمبووڵ کار ناکات! دە بڵێ بزانم چەند دەکات؟

شۆفێرەکە تووڕە بوو وتی:

کاکەگیان هەرچی حەزدەکەیت بیدەو تەواو.

پاشان ناڵێیت کەمە.

ناڵێم کاکە. من گوێ بە کەم و زۆری نادەم، هەرئەوەندە دەڵێم قابیلی ئێوەی نییە.

براکەم خەریکە تووڕەم دەکەیت. هەرچەندت دەوێ با بتدەمێ.

بابە خۆ ئۆتۆمبێلەکەم لێ ناکرێت، هەرچی پێت خۆشە بیدەو تەواو.

من نازانم چەند بدەم؟

شۆفێرەکە خەریک بوو تووڕە دەبوو:

کاکە خۆ لە شاخەوە نەهاتوویت! تا ئێستە سواری تەکسی نەبوویت. شتێکمان بدەرێ و تەواوی کە.

یەك لیرەت بدەمێ باشە؟

زۆرباشە گەر خەرجی نەکەم بۆ منداڵەکانم دەمێنێتەوە.

پارێزەر بەسەر خۆی نەهێنا. لەبەر خۆیەوە کەوتە حسابکردن:

" گەر یەك نەفەرت بهێنایە ٥ لیرەی دەکرد، ئێستە چونکە کەست سوار نەکردوە ١٠ لیرە باشە، دە لیرەیەکی دەرهێناو دای بە شۆفێرەکە:

فەرموو.

شۆفێرەکە تەماشای پارەکەی کرد، سەیرێکی پارێزەرەکەی کردو وتی:

ئەوە چییە؟

پارەیە! دە لیرەیە.

دەڵێی پارە بە فەقیر دەدەیت.

لە هەموو ئەم کاتانە ئەحمەد تەماشای دەکردو هیچی نەوت...

پارێزەر دوو لیرەی تریشی خستەسەر، شۆفێرەکە بە شێوازێکی ئارام پارەکەی پێدایەوە:

ئەویش ببە بیکە خەرجی خواردنی ماڵ و منداڵت.

پارێزەر لەگەڵ ئەو هەموو خوێن ساردیەی خۆی نەیتوانی بەرگەی ئەو توانجانە بگرێ و وتی:

زۆر لە خۆت دەرچوویت، بەئەدەبەوە قسە بکە، شۆفێرەکە ئۆتۆمبێلەکەی کوژاندەوەو دابەزیو چووە بەردەم کابراو وتی:
ئەگەر بەئەدەبەوە قسە نەکەم چی دەبێ؟ پیاویلکە من داوای هەقی خۆم دەکەم.
لە قڕەو هەرای شۆفێرەکە، کە وەکو مەستەکان هاواری دەرکرد. ئەو شۆفێرانەی لە وێستگەکە وەستابوون لە دەوریان کۆبوونەوە.
شوفێرەکە کاتێ هاوکارەکانی بینی بەرزتر هاواری کرد:
بۆچی من چیم وتووە؟ من داوای مافی خۆم دەکەم.
پارێزەر کاتێ ئەو قەرەباڵغییەی بینی دەستی هێنایە خوارو وتی:
زۆرباشە براکەم، کەس نایەوێت هەقت بخوات، چەند جارم پێوتی: "چەندت بدەمێ" تۆ هەر دەڵێت" قابیلی نییە، هەرچەند پێتخۆشە بیدە".
شۆفێرەکە تۆزێك دوور کەوتەوەو وتی:
تەماشای قەدو قیافەی تۆم کرد، وامزانی ئاغازادەی نەمزانی چروکی.
بزانە دەڵێی چی بێ مێشك.
بێ مێشك باوکتە... دایکتە...بۆچی جمێن دەدەیت؟
پارێزەر باش دووچار بوو بوو بۆ ئەوەی لە شەڕی رزگاری بێ پێنج لیرەی تری خستە سەر.
بەڵام شۆفێرەکە تازە ڕووی کرابووەوە بەو پارانە رازی نەدەبوو.
دەستی دا بە بندەستی پارێزەرەکەداو هاواری کرد:

- بیده به ماستو بیساوەرە سەرە کەچەڵەکەت! تاوانی خۆمانە، خۆمان بەکەم رادەگرین. وتم هەرچی حەزدەکەیت بدە، بەڵام هەندێك هەن ئەدەبیان هەیە، بەس ئەم کابرایە هەستی نییەو نازانێ نەزاکەت مانای چی!

ئەمجارە پارێزەر بە تەواوی توورە بووبوو بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

زۆر قسە مەکە ئەوە بیست لیرەو گۆرت گومکە، شۆفیرەکە پارەکەی وەرگرت، پارێزەر دڵخۆش بوو کە لە شەڕی ئەو رزگاری بووەو دەچێ بە لای کاریەوە، بەڵام شوفیرەکە بە توندی پارەکەی دا بەنێو چەوانی پارێزەرەکەو وتی:

تف لەو هەیکەلەت بێ نەزاکەت!

کاسەی سەبری سەر رێژی کرد نەیتوانی خۆی راگرێ وەکو بەوری دڕندە هاشاوڵی بۆ بردو یەخەی گرت، شوفیرەکانی دیکەش توورە بوو بوون زۆری نەمابوو بچنە خزمەتی پارێزەرو خزمەتێکی پێبکەن، لەوکاتەدا ئەحمەد کە لە دوورەوە تەماشای ئەم نمایشەی دەکرد هاتە بەینەوە بەو قیافە گەورەی خۆی لێکی جودا کردنەوەو پەنجا لیرەی دا بە شوفیرەکەو وتی:

بیگرەو لێرە برۆ.

کابرا هەر کە پەنجا لیرەکەی بینی بێدەنگ بوو، ئەحمەدو پارێزەر لەناو کۆمەڵەکە چوونە دەرەوە، ئێستا ئیدی شوفیرەکە وازی هێنا

بوو، بەڵام شوفێرەکانی دیکە وازیان نەدەهێنا، لەدواوە هەر قرەقریان بوو توانجیان ئەهاویشت:

" ز..ز...ز.ر.رت"

" ئەوانە چین سوار تەکسی بن"

" خەتای تۆیە ئەو خوێڕیانە سوار دەکەیت"

"ئاخر ئەوانە چین تا سواری تەکسی بن"

"کەسێك دڵی نەهات پارە بدا وا باشە بە پاص هاتوچۆ بکات"

پارێزەر ویستی ئاوڕ بداتەوەو جوابیان بداتەوە، بەڵام ئەحمەد نەیهێشت. کاتێ لای کردەوە بینی شوفێرەکە دوو دە لیرەیی بە دەستەوە گرتووەو یارییان پێدەکات! خوێن پەڕییە تەوقی سەری، وەك شێت تەکانی دەدا تا خۆی لە نێوان بازووەکانی ئەحمەد رزگار بکاتو پەلاماری شوفێرەکە بدات! بەڵام ئەحمەد بە توندی ئەوی گرتبوو وتی:

بەسە واز بێنە گەر زیاتر لەسەری برۆیت سبەی بەسەری بەسراوەوە دەچیتە سەرکار.

چوونە ناو چێشتخانەکەو لە پشت مێزێکەوە دانیشتن، پارێزەر رەنگی وەکو گەچ سپی هەڵگەڕابوو تەواوی بەدەنی دەلەرزیو وتی:

مرۆڤی چۆن پەیدا بووە. زۆری نەمابوو بیخنکێنم.

ئەحمەد زەردەخەنەیەکی بۆ کردو وتی:

دوور نەبوو بە پێچەوانە بووایە. داستانەکەی منیش بەو جۆرە بوو، بەڵام من کەسێك نەبوو بکەوێتە بەینەوە، کار گەیشتە بن بەست. ئەوکات بیست دانە شوفیر پێکەوە بەربوونە گیانم کوتەیەکی باشیان کردم. لە هەمووی خۆشتر لە مەرکەزیش ئەوان شکاتکەر بوون کارەکە خەریك بوو بنجی پەیدا دەکرد.

پارێزەر وتی:

دەی بۆچی ئەو قسانە دەکەن، نرخی خۆیان ناڵێن؟

لەبەر ئەوەی گەر داوای ۱۰۰ لیرە یان ٥٠ لیرە بکەن تۆ ناچار دەبێت بیاندەیتێ.

پارێزەر بەسەر قسەکانی ئەوی سەلماند.

راست دەکەیت. ئێستە تێگەیشتم بۆچی بە قسە بۆت باس نەکردم. بە وتن تێنەدەگەیشتم، دەبێ بە بەرجەستەیی بەسەر مرۆڤدا بێ تا بە جوانی تێبگات. ئێستا من چۆن دەتوانم ئەو باسە بۆ دادوەر باس بکەم؟

ناکرێ، دەبێ بەسەر خۆیان بێت، ئەگینا باوەڕ ناکەن.

خەمێکی قووڵ نیشتبووە سەر روخساری پارێزەرو وتی:

راستە، هەر لەبەر ئەوەیە گەورەکان ئاگایان لە کێشەکان نییە، چونکە بەسەر خۆیان نەهاتووەو نەیان بینیوە.

